صابر گرد عازه بانی

# دەم کوتکردنەوەی ناحەزانی ئیسلام

## دەربارەی چەند کێشەیەکی ئاینی

بەرگی یەکەم

١٤٠٧ ك - ١٩٨٦ ز

# دەم كوتكردنەوەى ناحەزانى

# ئيسـلام

## دەربارەى چەند كێشەيەكى ئايينى

چـاپى يەكـەم

بەشـى يەكـەم

١٤٠٦ك ـ ١٩٨٦ز

بە پێنووسى
صابر حمد علي عبدالله گردعازەبانى

چاپخانەى ئيرشاد ـ بەغداد

# « پێشەکی »

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

**پێشکەشە :**

- بۆ هەموو ئـەو کەسانەی کەدەیانەوێ ، لـە ڕاستی ئاینی ئیسـلامی پیرۆز تێبگەن .
- بۆ گشت ئـەو سەر لێشێواوو گومڕابووانـەی کە کەوتوونەتە دوا هـەواو هـەوەس‌و قسـەو قسـەڕۆکی بێگانـە قین لـە دڵـەکانی بەرامبەر ئیسلام‌و یاسا پیرۆزەکەی .
- بۆ ئەو هۆشمەندو بیرو باوەڕ پۆڵایانەی ، ئـەوتۆ کە هـەرگیز پڕو پاگەندەی بێگانەو دوژمن‌و ناحەزانی ئیسلام کاریـان لێناکاو هەمیشە دەیانەوێ لـە ئاینی پیرۆزی ئیسلام زیاتر شارەزا بن ، بۆ ئـەوەی وەك هاوڕێیـە دلێرو ئازاو نـەترس‌و خـوا پـەرستە دڵسـۆزەکانی پێشەواو سەروەری ئیسلام ( موحەممەد ) درووری خـوای لـێ بێ ، بەرگری لـە ئاینەکەیان بکەن ، کە دروشـمی شـەرەفمەندی‌و خۆشەختی‌و سەر بڵندی‌و شـانازیتیان ، لـە دنیاو قیامەتدا ، وە بـە بەڵـگەی سەلمێنەری زانستیانە ، گومڕابووەکان ، پێ بهێننـەوە سەر ڕێڕەووو ڕێبازگەی ڕاسـتی خـوا پەرسـتی‌و دادپەروەی‌و شـادی‌و ئـازادی‌و بەختەوەری‌و کامەرانی .
- بۆ ئەو داماوانەی کە تووشی نەخۆشی دەروون دوودڵی بووینەو ، وە پەردەی گومان‌و دوودڵی ، چاوی ئەقڵ‌و دڵیانی کوێرکردووەو ناتوانن ڕاستی پێ‌ببینن هیوادارو ئـاواتـەخوازم لـە پەروەردگاری ئەم بوونەوەرەکە هوشیار بنەوەو سوود لەم پەڕتووکەم وەربگرن.

● بۆ ئەو هۆشمەندە بیرو باوەڕ پۆلایانەی ، ئــەوتۆ کە هــەرگیز نــەخۆش چۆن بــە دوا پزیشکی شــارەزاو لــێهاتوو دەگەڕێن ، شــار بــە شارو وولات بــە وولات ، هەروەها ئــەوانیش بــە دوا ڕاستی شت دەگەڕێن‌و دەیانەوێ ڕاستی ئاینــە پیرۆزەکەیــان‌و نهێنی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئــان بزانن •

**خوێنەرانی بەڕێزو خۆشەویست :**

پێش ئــەوەی بچمە ناخی باسەکەوە ، دەمەوێ بڵێم ، ئەوەی کــە هانی دام‌و باڵی پێوەنام ، بۆ لێکۆڵینەوەو دووان لــەم جۆرە باسانە ، هەندێ قســەی پڕوپووچ‌و لاوازی ئــەو کەسانە بوو کە لــەم دووایەدا هەندێك لــە نــەزان‌و نــەفــامەکانی ئــەم چاخــە ، وەك بنێشــتە شــینکە دەیــان جوویەوە ، ئــەویش هەر قســەو قســەرۆکی دوژمنانی ئیسلام بوو ، کە دەربارەی یاسای پیرۆزی ئیسلام ، زۆر بــە شێوەیێکی نادروستانەوە بۆی چووبوون‌و چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزیان کردبوو بە بەڵگە ، بــە بێ ئــەوەی لەهودەی مەبەستی ئــەو ئــایەتانــە بگەن ، کــە گوایا ئاینی ئیسلام ، ئاینێکی دووا کەوتووەو جیاوازی لــە نێوان پیاوو ئافرەتدا دەکــا •••

بەڕاستی کاتێ بیرو ڕای زانستی‌یانــە شــوێنی بڕوا دەبێ‌و بــەکارێکی زانستی‌یانە دادەندرێ ؛ کە بــە بەڵــگەی زانستی‌یانــەی ئەوتۆ بەرپەرچی ئــەو بیرو ڕایانــە بدرێتــەوە کە کەس نەتوانێ دانی پیانەنێ‌و بەرامبەری بووەستێ • ئەوەی کە لێرەدا مەبەستە ئەوەیە ، کە ئێمە ئەگەر بمانەوێ لــە شت بگەین‌و مانای ئایەتــەکانی قورئــانی پیرۆز تێبگەین‌و قســەو قسەرۆکی ئــەو نووسەرو هەرزەگۆیانــە بەر پەرچ بدرێتــەوە ، هەرگیز نابێ بەکسەر خۆمان بشلەژێنین‌و هەڵبچین ، چونکە ئەمە مەســەلــەیەکی ئیقنــاع کردنە بە بەڵــگەی زانستیانەی سەلمێنــەر ، نــەك بــە هەڕەشــەو

گوڕەشەو ••••• وە لــە هەمان کاتیش‌دا نابێ باوەڕ بــە نووسینەکانیان بکەین‌و هەرچی‌یان ووتوویانە باوەڕی پێ‌بکەین ، بــە بێ ئــەوەی بــە شێوەیەکی زانستانە لەی نەکۆڵینەوە• جا لێرەدا بە پێی تواناو بە پاڵپشتی

خواو بیرو ڕای زانایانی ئیسلام ، بەرپەرچی هەندێك لەو بۆ چــوون‌و بیرو ڕای ئــەو کەسانەم دایەوە ، بــە هیواو ئاواتی ئــەوەوە کە گشت خوێنــەران سوودی لێ وەربگرن •

**صابر گرد عازەبانی**

★ ★ ★

## کورتە باسێکی مێژوویی دەربارەی چەند ژن هێنان ، هەر لە سەرەتای بوونی ئادەمیزاد تا ئەم سەردەمە

## بە پێی داب‌و نەریتی کۆمەڵانی خەڵکی سەر ئەم زەمینە

بەڕاستی باسی چەند ژن هێنان باسێکی تازە نی‌یە ، وە لە پێش هاتنی ئاینی ئیسلامی پیرۆزدا بە چەندان سەدە باو بووە لە نێوان نەتەوەکانی جیهاندا ، بەبێ ئەوەی ڕادەو سنوورێکی دیاری کراوی بۆ داندرابێ ، وە هیچ دەستوورو یاسایەك بە درێژایی مێژووی ئادەمیزاد نەبووە کە ئەم چەند ژن هێنانە بە خراپ لە قەڵەم بدا . وە ئەگەر ئاوڕێك لە ڕۆژگاری دێرین بدەینەوەو سەیری پەرتووکە ئاینە پیرۆزەکان بکەین ، دەبینین گەورەمان حەزرەتی ئبراهیم پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێ ، دوو ژنی هێناوە کە یەکێکیان ( سارا ) خاتوونە ، وە ئەویتریشیان ( هاجەر ) خاتوونی دایکی حەزرەتی ئیسماعیل پێغەمبەرە دروودی خوایان لێ بێ .

وە هەروەها چەند ژن هێنان بە درێژایی ڕۆژگاری مێژووی قۆناغی ئادەمیزاد لە سەر ئەم زەمینەی پیا ڕۆیشتووە ، شتێکی باوو ڕەوا بوو . هیچ یاسایەك نەبووە لە هیچ سات‌و سەردەمێکا قەدەغەی بکا ، وە یا بە خراپ‌و ناڕەوای بزانێ‌و بەرپەرچی بداتەوە ، هەروەها مایەوە تا سەدەی حەڤدەهەم بێ ئەوەی زانایانی کڵێسەکان دەربارەی ئەم مەسەلەیە شتێك بدرکێنن ، هەتاکوو زۆر ترینی نەتەوەکان چەند ژن هێنانیان لە نێواندا بڵاو ببۆوە ، وەکوو ڕۆمان‌و یونانیەکان‌و گشت نەتەوەکانی‌تر ، هەروەها ئەفلاتون‌و ئەرستۆ لایەنگیری ئەم مەسەلەیان دەکردو بەخراپیان لە

قەڵــەم نەدەدا ، وە هەتا هیچ زانای فەیلەسوفێك بە ناڕەوای نەدەزانــی •

هەروەها چەند ژن هێنان لە نێو دووڕگەی عەرەب دا ئەمێکی بــاوو ڕەوا بوو لە پێش هاتنی ئایینی ئیسلام دا لە چاخی نەفامیو نەزانین دا ، هەر وەکوو نەتەوەو کۆمەڵانی خەڵــکی تری سەر ئەم زەمینە • هەتاکوو وا دەگێڕنەوە ، چەندان لەو عەرەبانەی کە ئیسلام دەبوون ، هەر یەکەیان چەند ژنێکی هەبووە ، هی وا هەبووە کە ئیسلام دەبوو دە یا هەشت یــا پێنج ژنیهەبووە ، وەکوو ( غیلان کوڕی سلمة الثقفي ) کاتێك کە ئیسلام بوو دە ژنی هەبووە ، وە هەموویان لــە گەڵیــا ئیســلام بوون • پێغەمبەر درووودی خوای لێ بێ پێی فەرموو :

( اخْتَرْ مِنْهُنَّ أَرْبَعاً - وفي لفظ آخر - إِمْسِكْ مِنْهُنَّ أَرْبَعاً وَفارِقْ سائِرَهُنَّ ) •

واتــە : چواریان لێ هەڵبژێرەو دەست لەوانیتر هەڵــگرە •

وە هــەروەها وا دەگێڕنــەوە ( نوفل کــوڕی معاويــة الديلمی ) و قەیسیی کوڕی الحارث الاسدي ) کە ئیسلام بوون ، یەکەمیان پێنــج ژنی هەبووە ، وە دووەمیشیان هەشتی هەبووە •

بەهاتنی ئایینی ئیسلامی پیرۆز ، بــە تەواوی ئــەم چەند ژن هێنانەی بەتاڵ نەکردەوەو بەخراپی نەزانی ، بەڵام ، سنووروریاســایەکی ڕاستو دروستو ڕەوای ئەوتۆی بۆ نەخشــەکێشا کــە لــە پێش دا هیچ ڕادەو سنوورێکی دیاری کراوی نەبوو • ڕێگای بە پیاو دا لــە ژنێکەوە تا چوار بهێنیو پێکەوە کۆیان بکاتەوە ، لەو سەردەمەی دا پیاو دەیتوانی بە ویستو خواستو هەوەس ئارەزووی خۆی هەر چەندە ژنی بهێنایە پێکەوە کۆی دەکردنەوە بە بێ ئــەوەی سنوورو یاسایەك هەبێ قەدەغەی بکا ، وە یــا ڕەخنــەی لێبگریو لــە دژی ئەم هەڵویستە بووەستێ • لــە هــەمان

کاتیش دا ئیسلام مەرجی چەند ژن هێنانیشی بەستەوە بەو پەڕی ڕێگا دان لە گەڵ ئەمەش دا مەرجی چۆنیەتی ئـەم ڕێگایانەشی بۆ نەخشە کێشا •

**( ئایەتی دیاری کردنی چەند ژن هێنانو مەرجەکانی )**

ئـەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە دەربارەی کچانی هەتیوی کە لەلای میرات گرانیان بوونو ئـەو میرات **گرانەش** لـە بەر ماڵی کچەکان یـا لەبەر جوانو شۆخو شەنگی‌یان مارەیان دەکردن بۆ خۆیـان ، بـەڵام ، ئـەوەندەی کەدابو نـەریتی ئـەو سـەردەم مـارەیی بۆ ئافـرەتـان دا ئەناودیاری دەکرد ، ئـەوان بۆیان دا ئەنانو ئەگەر شتێکی کە میشیان بۆ دابنـا بوایایە پێیانیان نـە ئەدا • ئەمجا خواوەندی میهرەبانو بەخشـنـدە قـەدەغەی کردن لـە مارەکردنی ئەم جۆرە کچانە مەگەر وەکوو ئافرەتانی تر مارەییو مافیان بۆ دابنێنو ستەمیان لـێ نەکەنو مافی ڕەوای خۆیـان وەك ئافرەتانی تر بـە تەواوی بدەنێ هاتەخوارەوە •

وەخواوەند فەرمووی :

**( وان خفتم الا تقسطوا في اليتامى )** •

**واتـە : ئەگەر ترستان بوو لەوە دادپەروەری نەکەن لە چەندایەتی** مارەیی ئەو **کچە** هەتیوانە کە ئەوان لـە ژێر **دەستەڵاتی ئێوەدان** •

**« فانكحوا ما طاب لكم من النساء »** •

واتە . بچۆن ئـەو ئـافـرەتـانەی کە خاوەن ماڵو شۆخو شەنگ و عازەبن مارەیان ببڕن لـە **خۆتان** کە هەوەسو ئارەزووتـان لـێیانـەو شـیاوی ئێـوەن •

« مثنى وثلث ورباع » •

واتــه : دوو دوو ژن مــاره بکــەن یاسێ ســێ یاچوار چــوار ، بۆ ئــەوەی کە ئەستەمو ستەمکردن لــە کچە هەتیو دوور بکەونەوە ، بــەم مەرجە بتوانن دادپەروەری بــە جێبێنن لــە نێــوان ئــەم ئافرەتانــەدا لەمانەوە لــە لایاندا بــە یاسای دەستووری خوا ، چونکی ئەگەر دا خوازی نەکەن لەنێوانیان لــە مارەکردنی ئەمانەیشــدا دوو چاری تاوانو گوناح دەبن ، وەکوو لە مارەکردنی هەتیوەکاندا •

« فان خفتم ألا تعدلوا فواحدة أو ما ملكت أيمانكم » •

واتە: ئەگەر ترستان بوو لە خۆتان ڕا نەدیت لەوە کە دادپەروەریتان لــە نێــوان ئــەم ئافرەتانەدا پێ ناکرێ ، ئــەوە تەنیا یەك ژن بهێنن ، وە یا لــەزەت وەربگرن لەو کەنیزانە کە بوون بە موڵکتان ؛ چونکی لە کەنیزەدا بەخشینو مارەیی پێویست نی‌یە ، وە لەبەر ئەوە کە موڵکن ئەتوانن بــە هەموو جۆرێ دەســتکاری‌یان تیــا بکەن • بــەڕاســتی ئــەگــەر مرۆڤ ڕاستەوخۆ بیر لەم ئایەتە پیرۆزە بکاتەوە ، زۆر بە ئاسانی بۆی ئاشــکرا دەبێو دەردەکەوێ کە چۆن دەقی قورئانی پیرۆز بازنەی چەند ژن هێنانی تــا چ ڕادەیەك لەسەر پیــاو تەسك کردۆتەوە ، ئــەگەر بڕوای تــەوای بە ئاینە پیرۆزەکەی هەبێو خۆی نەفامو گێل نەکاو لە یاسای دەستووری ئاینی ئیسلام لانەدا • چونکە هەر تەنیا ترسان لە یا کسانیو دادپەروەری نەکردن لە نێوان ژنی یەکەمو دووەم یا سێیەم یا چوارەم ، ئــەوە حەرام دەبێ بەپێی دەقی فەرموودەی خــوا پیاو ژنێکی تربهێنی ، وە دەبێ هەر لــە سەر یــەك ژن بمێنێتــەوە ، بۆی نی‌یە ژنێــکی تربهێنی • جــا ئــەو ترسانەش هەر تەنیا چ لــە توانای پیاو دابێ کە وەك جیاوازی نەکردن لــە

نێــوان ئافرەتانەوە لە هەموو بارێکەوە ، کە ئەمەیان هەر پیاوێك بیەوێ دەتوانێ پێی هەڵسێ ، وە یــا خۆشەویستی شــاراوەی ناخی دەروونی بێ کە ئەمەیان زۆر زەحمەتە لــە توانــاو وزەی هیچ کەسێك دانی‌یە کە گشت ژنەکانی وەك یەك خۆش بووێ • جــا هەر لەبەر ئەمە بوو کە ئــەم ئایەتە هاتەخوارەوە ، زۆر لە موسڵمانەکان ، ئەوانەی چەند ژنیان هەبوو ، هەڵوێستیان دەربارەی چەند ژن هێنان زۆر حراپو شپرزەبوو ، چونکە هەستیان کرد کە لــە توانای هیچ کەسێك دانی‌یە ، هەر چەندە خاوەن بیرو باوەڕێــکی تــەواو خــاوەن ویژدانو ئیمان بێ ، جڵەوی ئــەڤینو خۆشەویستی پێ بگرێو بتوانێ گشت ژنەکانی وەك یەك خۆش بووێن ، هەر چەندە بە ئاشکرا دەتوانێ هیچ جیاوازێکیان لــە نێوان نەکات ، جــا لەبەر ئەمە ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوارەوە دەربارەی ڕووکردنەوەی ئایەتی ( فا نْ خِفْتُمْ ألاّ تعْدِلوا فواحدةً أو ما ملکت أیمانکم ) •

هاتەخوارەوە • خوا فەرمووی :

« ولن تستطیعوا أن تعدلوا بین النساء ولو حرصتم » ◦

واتــە : ئێوە هەرگیز ناتوانن کە یەکسانی بــە ئاشکراو نهێنی لــە گەڵ ژنەکانتاندا بکەن ، هەر چەندە هەوڵیش بدەن ؛ چونــکی مــەردوم وەکو ناتوانێ قەدەغەی چاو بکا لــە بینینو قەدەغــەی گوێچکە بکا لــە بیستن ، ناتوانێ قەدەغەی دڵیش بکا لــە زیادە خۆش‌ویستن بۆ ژنێ لــەو ژنانە گەلێ جوانو شۆخو شەنگو بــالاّ بەرز بێ • هــەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەرمان نۆرەی ڕادەگرت لــە نێــوان خێزانــەکانیــاو دەیفــەرموو :

( هذا قسمي في ما أملك فلا تؤاخذني فیما تملك ولا أملك ) •

واتــە : پەروەردگارا ئەمەنەو بــەکارو توانــای منــە لــە نێــوان

خێزانەکانما بـە ڕادەی ئەوەندە توانـاو دەستەڵاتم ئەڕواو ئەتوانم ، ئیتر لێم مەگرە لەو شتە کە تۆ دەستەڵاتت ئەڕوا بەسەریا و مـن دەستم نـاڕوا بـە سـەریـا •

« فلا تميلوا كل الميل فتذروها كالمعلقة » •

واتە . بەڵام لامەدەن لـە چاودێرایەتی دادو دادکاری لە نێوانیاندا بـە لادانێـکی تەواو هەتا خێزانەکانتان وا لێبکەن ، وەکوو ئافرەتێ کـە نـە مێردی هەبێو نـە تەڵاق درابێ • بەڵکو ئەگەر لاتان دا لـە هــەق بالادانێکی کەم بێ • پێغەمبەر فەرموویەتی درووودی خـوای لـێ بێ : ( مَنْ كانت له إمرأتان يميل مع احدهما جاء يوم القيامة واحد سقيه مائل ) •

واتـە : هەر پیاوێك دوو ژنی هەبێو یەکسانیان لـە نێـوان نـەکـا لایەنگیری یەکێکیان بێ لـە سەر ئـەویتریـان ، لـە ڕۆژی قیـامـەدتدا بەلاخواری دێت ، یانی لایەکی لاشەکەی لە لایەکەی تر جیاوازەو وەك شەلەل لێدا بێ وایە •

( وان تصلحوا وتتقوا فان الله كان غفـورا رحيمـا ) ( الآية ١٢٩ ـ سورەتی ـ النساء ) •

واتـە : ئەوسا ئەگەر ئەو خراپانەی کردووتانـە بە چاکەکـردن تۆڵەیان بکەنەوە دەربارەی خێزانەکانتانو ئیتر خۆتان بپارێزن لەمەو دوا لەو خراپانەی پێشوو کە کردووتانە ، ئـەوە خوا لە گوناح خۆش دەبێ ئەگەر بەندە بە تەواوی پـەشیمان بۆوە لـەو خراپانـەی کـە لە پێش دا کردوویەتی ، چونکە خوا زۆر بـە بەزەییو میهرەبانە بەرامبەر بەندەکانی خۆی ئەگەر بەڕاستی لـە تـاوانو خراپـەکانی وازیان هێنـاو پەشـیمان بوونەوەو ڕوویان لە خواکرد •

جا لە دوای ئەوەی مانای ئەم ئایەتانەی سەرەوەمان بۆ ڕوون بۆوەو زۆر باش بۆمان ئاشكرا بوو كە ئایینی پیرۆزی ئیسلام تا چ ڕادەیەك گرنگی بە مافی ئافرەت و پاراستنی ئابڕوو شەرەف مەندایەتی پاراستووە • ئەمجا بە ڕاستی ئەگەر زۆر بە وردی سەرنج بدەینە گشت ئەو بڕیارانەی كە ئیسلام داویتی دەربارەی مافی ئافرەت و پەیوەندی نێوان ژن و مێردایەتی و ئەركەكانی وە چ لە بارەی شووكردن بێ یا خود هەر شتێكی تر بێ كە پەیوەندی بە بەرژەوەندی ئافرەتەوە بێ ، ئەمە هیچێكیان بێ هوودە نینەو دان پێدانان و لایەنگیری مافی ئافرەت و دان پێدانانە بە ڕاستی باری كۆمەلایەتی ئافرەت لە نێوان كۆمەلانی خەلك دا لە سەر ئەم زەمینەدا ، نەك بۆ چەوسانەوەو بەندو دیل و كویلاتی ئەو بێ ، بەلكوو هەموو دەرگایەكی بۆ خراوتە سەر پشت بۆ ئازادی و سەر بلندی و پایە بەرزی ، هەتاكوو ژن هێنان لە ڕاستی دا لە یاسای پیرۆزی ئیسلام دا وای لێهاتووە بە پێ و گوێرەی دەقی ئەو ئایەتانەی كە باسمان كردن كە بریتی شێ لە سەر یەك ژن هێنان ، وە چەند ژن هێنانیشی وا لێ كردووە كە زۆر بە دەگمەن ڕوو بدا كەوا هیچ پێویست بەوە نەكا دەستووری چەند ژن هێنان هەلبوەشێتەوەو قەدەغە بكرێ چ لەم سەردەمە دا یا لە ڕۆژگارانی داهاتوو دا بەو مەرجانەی كە ئیسلام دایناوە ، ئەگەر پەیڕەوی بكرێ • ئەوەیە ڕاستی هەلوێستی ئیسلام بەرامبەر ئافرەت و مافەكانی •

بەلام ، لێرەدا ئەوەی سەر سوڕمێنەرو سەرنجی خەلك ڕابكێشی كە بپرسن و بلێن ئەمەیە :

كەواتە بۆچی هەندێك لە موسلمانانی ئەم سەردەمە كە خۆیان بە خاوەن بیرو باوەڕو ئیماندار دەزانن نوێژ دەكەن و ڕۆژوودەگرن و

زەکات دەدەن‌و حەج دەکەن ، لە هەمان کاتدا خواوەند دەرگای بەخشندەیی بۆ زۆریان خستوتە سەر پشت‌و ماڵ‌و خاوو خێزانێکی رێك‌و پێکیان هەیە ، دەبینین هەڵدەستن ژنێکی تر یا زیاتر دێنن . جا هەندێ پێ ناچێ ئاژاوەو پشێوی‌و ناکۆکی شابالّی بەسەر ئەو ماڵ‌و خاوو خێزانە دا دەگری‌و ماڵی پڕ لە ئاسایش‌و خۆشی‌و شادی‌و کامەرانی‌و ئازادی دەبێتە دۆزەخێك لە دۆزەخەکانی جیهان .

جا لە ناخی قووڵایی دڵمەوە ، لە پەروەردگاری مەزنی ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلام کە دایناوە دەربارەی ماف‌و یەکسانی ڕاگرتن لە نێوان خێزانەکانی‌دا جێ بەجێ ناکاو ئی واش هەیە ، هەر لەپێش ئەوەی ژنی دووەم بهێنێ لەگەڵ خزم‌و کەسی ژنی دووەم وا ڕێك دەکەوێ کە ژنی یەکەم تەڵاق بدا ئنجا کچەکەی خۆیانی پێ دەدەن ، یاخود ماڵی تایبەتی بۆ جیابکاتەوە وە یا ... جا کە ژنی دووەم یاسێیەم یا چوارەمی لە پاش ماوەیەکی کەم کە گوازتیەوە ، زۆر جار وا دەبێ لە نێوان ژنی یەکەم‌و دووەم دەبێتە شەڕو ئاژاوەو پشێوی‌و خەڵکی گەڕەکەکەیان بەسەرا دادەقرقرێ‌و ... جا خۆ ئەگەر پیاوەکەیان بەسەر ئەم شەڕو ئاژاوەو پشێوی‌یە دا هاتەوە ، ئەوە هەر خوا بۆ خۆی دەزانی کە چ بەژنی یەکەم دەکا ، وای پێ دەکا کە با بە دەواری شڕی نە کردبێ .. زۆر جاریش وا دەبێ ژنی پێشو بە خۆی‌و منالّەکانیەوە دەردەکا . ئەمجا ژنەی داماو وەك سەر لەشکرێکی سوپاکەی لە گۆڕەپانی شەڕا بەزی بێ ، ئەوها بە دڵێکی شکاو غەمگین‌و چاو بە فرمێسك دەچێتەوە ماڵی باوکی یا برای یا هەر خزمێکی تری ... جا لە پاش ماوەیێکی کەم ، ئەوانیش لە منالّەکانی بێزار دەبن‌و چەند بیانوو لە منالّەکان دەبیننەوەو زۆر لە ئافرەتەکە دەکەن کە منالّەکانی بەسەر باوکیان‌دابداتەوە،

ئەگینا ئەویش دەردەکەن • ئەمجا لێرەدا هەڵوێستی ژنــەی داماو ، یەك جار پەرێشانو نالەبار دەبێ ،نازانێ سەری خۆی بۆ کوێ هەڵگرێ بڕوا، نازانێ هەشی کوێ بکا بە سەر خۆیو ئاگری تێبەر بێو ڕزگاری بێ لەو دەردو چەرمەسەرییو تـەنگو چەڵەمەی تێی کـەوتووە ••• ئەگەر بەقسەیان نەکا ، ئەترسێ بــە زۆر منداڵەکانی بــە سەر باوکیان دابداتەوەو خۆشی لە پێش چاویان سووكو ڕیسوا بێ ، ئەمە لەلایەکەوە وە لەلایەکی تریشەوە ، زۆر دڵی زامداری بە منداڵەکانیەوە دەبێ ، کەبچنەوە لای باوە ژنیانەوە کە زۆر بێ نازو خزمەت دەبن ••• وە زۆر جاریش وا دەبێ ، کارەساتی زۆر گەورەو سامناكو پڕ لـە مەترسی ، لە ئەنجامی دوو یا سێ یـا چوار ژن هێنان ڕوو دەدا چ لـە نێوان ژنەکانەوە ، وە یا لە نێـوان پیاوو ژنەکانەوە ، یا لـە نێوان خزمو کەسی ژنەکانو پیاوەکەوە • زۆر جاریش وا دەبێ پیاو ژنێك لـە ژنەکانیو منداڵەکانی دەردەکا ، ئەوسا ئەو ئافرەتە داماوەش هیچ خزمو کەسێکی ئەوتۆی نابێ کەبچێتەوە لایانەوەو لە ژێر سێبەریان بحەوێتەوە • جا ئەم ئافرەتە زۆر بە کەساسیو هەژارییو قەلەندەری لەگـەڵ منداڵــە داماوەکانی لــە کونجێك خۆیان هەر کوێیکی هەبێ مەلاس دەدەن • ئەوجا دایکە هــەر چــەندەی دەکا منداڵــەکانی پێ بەخێو ناکرێ • وە زۆر جاریش وا دەبێ هەژارییو بێ دەرامەتی وا لەو ئافرەتە بێ بەختو پەرێشانە دەکا کە دووچاری کاروئاکاری زۆر خراپو نالەبار بێی لە پێناوی ژیانو گوزەرانی خۆییو منداڵەکانی •

جـا ئێمەش لێرەدا کاتی ئـەوەمان هاتـووە کە ئـەم پرسیارانـەی خوارەوە ئاراستەی ئـەو جۆرە پیاوانە بکەین کە هەڵوێست و ڕەفتـاریان ئـەوها خـراپو نـالـەبارە بەرامبەر ژنـەکانیانو یەکسانیان پێ ناکرێو هەڵـدەستن ژنێـکیان هەیە دەیکـەن بــە دوو یاسێ یا چوار کە پێیان بڵێن :

ئەڵێ کاکی برا ، ئیسلام فەرمانی پێ کردووین کە دوو یا سێ یـا چوار ژن بهێنین‌و یەکسانیان لەگەڵ نەکەن‌و دەستی ستەم‌و ستەمکاریان بۆ درێژ بکەن زۆر بەبێ نارەوایانەو نامرۆڤایانە لەگەڵیان بجوولێنەوە ؟ یـا خود بیرو باوەڕی ئیسلام دژی ئـەم هەڵوێستـە چـەوتانـە کـە زۆر بەتوندو تیژی ئایەت‌و فەرموودەکانی پێغەمبەرمان درووودی خوای لێ بێ هەڕەشە لەو جۆرە پیاوانە دەکا کە ڕەفتاریان ئەوها نالەبارو خراپ بـێ بـەرامبەر ژنەکانیانـەوە ؟

ئێمەش لـە وەڵامی ئـەم پرسیارانەی سەرەوە دەڵێین ، هەر وەکوو لـە پێش دا ڕوونمان کردەوە بـە بەڵـگەی سەلمێنەرو دەقی قورئانی ، کە چـۆن خواوەند فەرمانی پێ کردووین ، کە چۆن پیاو ڕەفتار لـە گـەڵ ژنەکانیان بکـەن ، وە ئەگەر هاتوو پەیڕەویشی یان کرد ، ئەمە تـاوان‌و گونـاحی ئیسلام نی‌یە ، بەڵـکوو تاوان‌و گوناحی ئـەو جۆرە بـە نـاو موسڵمانانەیە کە دوورن لـە ئیسـلام و ، وە هـەروەها ئیسـلامیش ڕەك نـاسـمان‌و ڕێسمان لێیان دوورە ، چونـکە سەرپێچیان لە یاسای پیرۆزی ئیسلام کـردووەو خۆیان دووچاری بەڵای ناگەهانی خوایی کـردووە سەبارەت بەو کردەوە خراپ‌و نالەبارانەی کە بەرامبەر ژن‌و منداڵەکانیانەوە کـردویـانـە •

جـا بـا ئـەو جۆـرە موسڵمانـانـەش ڕۆژێ لـە بریتی حەڤدە ڕەکەعات نوێژ سەدو حەفتا ڕەکەعات نوێژ بکەن‌و لـە بریتی حـەجێك بیست حەج بکەن‌و لـە بریتی دینارێکی زەکات دە دینار بدەن‌و لـە بریتی مانـگی ڕەمەزانان بـە ڕۆژوو بوون بـا بەدرێژایی سـاڵ هەر بە ڕۆژوو بـن ، ئـەڵێین ، ئـەم جۆرە موسڵمانـانـە زۆر تاوانبارو لـە ئیسـلام

دوورن ؟ وه هیچ دوور نی‌یه که خواوه‌ندی گه‌وره‌ومیهره‌بان ئـه‌و هه‌موو نوێژکردن‌و ڕۆژوو گرتن‌و زه‌کات دان‌و حه‌ج کردنانه‌یان لێ گیرا نه‌کاو فرشته‌کان هه‌موویان به‌سه‌ر داده‌ده‌نه‌وه ، چونکه شیوه‌ن‌و گریان‌و برسێتی ژن‌و منالآنی بێ ده‌سه‌لآت‌و غه‌مگین‌و هه‌ژارو داماو وسـتەم لێکراوان ، لـه‌لایان خواوه کارێکی زۆر گه‌وره‌یه‌و هیچ په‌رده‌یه‌ك‌و په‌رژینێك لـه نێـوان خواوه‌ندو ستەم لێکراوان نی‌یه ، ئه‌گه‌ر ستەم لێکراو لـه خوا بپاڕێتـه‌وه ؟ زوو نزاکه‌ی گیرا ده‌بێ .

جـا ئـه‌و جۆره پیاوانه بـا لـه خوا بترسێن‌و لـه پێغه‌مبه‌ر شـه‌رم بکه‌ن‌و به‌زه‌ییان به‌و منال‌و ئافره‌تانه بێته‌وه که خوا کێڕاونی به سپارده‌یه‌ك لـه به‌رده‌ستیانه ، بـا ستەمیان لێ‌نه‌که‌ن‌و ، ئه‌گه‌ر لـه ژنێکه‌وه کردیـان بـه دوو یا سێ یا چوار ژن بـا یه‌کسانی‌و دادپه‌روه‌ری تـه‌واویان لـه نێـوان بکه‌ن ، ئه‌گینا خۆیان تووشی سزای توندو تیژی خواوه‌ند ده‌که‌ن لـه ڕۆژی قیامه‌تدا .

جـا لـه ناخی قوولایی دڵمه‌وه ، لـه په‌روه‌ردگاری مه‌زنی نـه‌م بوونه‌وه‌ره ده‌پاڕێمه‌وه کـه دڵی ئـه‌و پیاوه دڵ ڕه‌قانه نـه‌رم بکا به‌رامبه‌ر ئـه‌و ژن‌و منالآنه‌ی که ئه‌مه‌یه ڕه‌فتارو هه‌ڵوێستیان . وه هه‌روه‌ها تـکا له‌و برایانـه‌ش ده‌که‌م که لـه خۆیـان ڕانـابینن‌و نـاتوانن ئه‌و یه‌کسـان‌و دادپـه‌روه‌ریه‌ی که یاسای پیرۆزی ئیسلام داینـاوه بیکه‌ن به‌رامبه‌ر چه‌ند ژن هێنـان ، بـا لـه ژنێك زیاتر نه‌هێنن ، تـا خۆیـان دوو چـاری بێ فـه‌رمانی خـوا نه‌که‌ن .

# بۆچی ئیسلام ڕێگای چەند ژن هێنانی داوە ؟

پێش ئەوەی بچینە ناو باسەکەمانەوە ، پێویستە باش بزانین کەوا ئاینی پیرۆزی ئیسلام یاساو ڕژێمێکی دروست و ڕاستی ئەو تۆیە ، بۆ بەرژەوەندیو خۆش بەختیو ئاسوودەیی و ئازادیو کامەرانیو شادیو ڕزگاربوونی ئادەمیزاد، لە هەموو کووتو زنجیرو دیلایەتیو کوێلایەتیو ژێردەستیو چەوساوەیی ، بە هەموو جۆرێکیانەوەو دادی کۆمەلآیەتی هاتووتە خوارەوە ، وە لە هەمان کاتدا لە هیچ باسو مەسەلەیەك کەپەیوەندی بە بەرژەوەندی ئادەمیزادی موسڵمانەوە هەبێ چ ئافرەت بێ یاخود پیاو ، خۆی لێ ی بە دوورە پەرێزو گۆشەگیری نە گرتووە، وەسنووری بۆ هەموو مافێکیان بەیەکسانیو بەبێ جیاوازی کێشاوە ، تا هەر یەکەیان لەم سنوورە دیاری کراوەی بۆیان دانراوە دەرنەچن ، وە ئەگەر هاتوو سەر پێچیان لێ کرد ، ئەمە تاوانو گوناحی ئیسلام نییە ، بەڵکوو تاوانی خۆیتیان • وە هەرگیز ڕێگاسی بە بەدخوویيو دامێن پیسی نەداوە لە نێوان کەمەڵگای ئیسلام دا بەلآوبێتەوە ، چونکە یاساو ڕژێمێکی خوایییە کە لە گەڵ خواستو نەریتیو خووی سروشتی دەروونی ڕاستە قینەی ئادەمیزادی خاوەن بیرو باوەڕیی بە پەروەردگاری دا ئەگونجێ ، وە لەگەڵ هەموو چاخو سەردەمێكو شوێنکا لە سەر ئەم زەمینە پانو بەرینەدا ئەگونجێ ، ئەگەر دەقی یاساکەی بە ڕاستو دادپەروەری جێ بەجێ بکرێ •••

جا لێرەدا لەشی کردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەم خاڵانەی خوارەوە ، ڕاستیو دروستی ، باسو کێشەکەمان بۆ ساغ دەبێتەوە سەبارەت بیرو باوەڕی ئیسلامو ڕێگا دانی بە چەند ژن هێنان ، وە چۆنیەتی ڕێگا

دانــەکەشــمان ، بۆ ڕوونو ئاشکرا دەبێتەوە ، تــا قین لەدڵانو ناحەزانی ئیسلام پێ دەم کوت بکەینەوە :

۱ ــ لــە سەر ژماردنێــکدا کە لەگێتی کراوە ، وا دەرکەوتووە کــە ژمارەی ئــافــرەتــان لــە ژمارەی پیاوان زیاتر بووە ، وە هەتــا لە هەندێك لــە وولاتــانــدا ژمارەی ئافرەتانیان چەند ئەوەندەی ژمارەی پیاوان بووە، وەك لە باکووری ئاورووپادا دکتۆر موستەفا سوباعیی دەڵێ : ( پزیشکێکی خانــەی مناڵبوون پێی وونم لــە ( هلسنکی ) ( فلندا ) هــەر لــە نێوان چوار مناڵ یا سێ کە ئــەبن یەکێــکیان کوڕەو ئــەوانیتریــان کچن ) . وە ســەرەڕای ئــەمەش ، وا دەرکــەوتووە کــە هەمیشــە نێرینە زیاتر دووچاری مردنو لــە نــاو چــوون دەبن لــە مێینە لــەکاتی لــە دایــك بوونو منــاڵیدا ، هــەر وەکوو لەســەر ژماردنێــکی گشت نەتــەوەکان دەرکەوتووە ، وە هەتــاکوو ئــەم دیاردەیەش لــە نەتەوە کەمەکانیشــدا دەرکەوتووە ، کــە ژمارەی مێینەکانیان لــە ژمارەی نێرینــەکانیان بــە ڕێــژەی ۱۵ر٦ لەسەدا زیاتر بووە . بەڕاستی کێشەی زیادبوونی ژمارەی مێمێینــە لــە ســەر نێرینە شتێکی تــازە نیــە کــە دۆزرابێتــەوە لــەم سەردەمەدا ، بــەڵــکوو خەڵك هەر لــە پێشیندا لــە دێرین ڕۆژگارە ئــەم ڕاستیەیان دەزانی ، لە پێش ئــەوەی کە زانایانی سەر ژماردن لەم دواییەدا دانیــان بەمەناوە ، وە هەروەها کێشەی زیادەی ژمارەی ئافرەتــان لە سەر پیــاوان کێشەیەکی ئــەوتۆیە کە زوربــەی زۆری وولاتــەکانــی گێتی گرتووتەوە ، وە ئەگەر نەڵێن گشتیان گرتووتەوە . ئــەم سەر ژماردنانەی خوارەوەش ڕاستی اس و کێشەکەمان بۆ ئاشکرا دەکەن :

۲ ــ لەو پەڕتووکەی کە ساڵانە یەکێتی نەتەوە یەکگرتووەکان دەری دەکەن سەبارەت بەسەر ژماردنی ژمارەی دانیشتوانانی جیهان کە لــــە

ساڵی ١٩٦٤ دا دەرچووە ، ئەم سەر ژماردنانە ئەمەیان دەرخستووە کـە ژمارەی ئـافـرەتـان لـە ژمارەی پیاوان بـەم شـێوەیەی خوارەو، لـە چەند وولاتێـکدا زیاتربووە :

١ ـ لـە یەکێتی سۆفیەت (٢٠) ملیۆن ئافرەت لە ژمارەی پیـاوان زیاتـر بووە •

٢ ـ لـە وولاتە یەکگرتووەکانیش دا ژمارەی ئافرەتان دوو ملیۆن لـە ژمارەی پیاوان زیاتر بووە •

٣ ـ وە لە ئەلمانیەی ڕۆژ ئاواشدا ژمارەی ئافرەتان سێ ملیۆن لـە ژمارەی پیاوان زیاتر بووە ، وە لە ئەرجوای (١٧) ملیۆن‌و لە بورتوریکـو (٢٤) ملیۆن‌و لـە سلفادۆر (٢٧) ملیۆن ، وە هەروەهاش ژمارەی ئافرەتان لە ئۆغندەش دا لە پیاوان زیاتر بووە •

وە سەرە ڕای ئـەم سەر ژمێریەش وا دەرکەوتووە کە لە هەموو جیهاندا تەمەنی ئافرەتان لـە تەمەنی پیاوان درێژ ترە ، وە ئـەم زیادیەش لـە زۆر وولاتاندا دەگاتـە ڕادەیەکی زۆرو دیاردەیەکی ئاشکرا وەك :

١ ـ لە یەکێتی سۆفیەت دا تەمەنی ئافرەتان (٨) هەشت ساڵ لـە هی پیاوان زیاترە •

٢ ـ لـە فەرەنسا (٦ر٨) سـاڵ ، لـە وولاتـە یەکگرتووەکانیشـدا (٦ر٦) ساڵ ، لـە بەریتانیاشدا (٦) ساڵ تەمەنی ئافرەتان لـە هی پیـاوان زیاتـرە •

لەو هەڵ ژماردنانەی لە ساڵی (١٩٦٥) دا کراوە ، وا دەرکەوتووە کە لـە هۆلندە دا بەرامبەر هەر (١٠٠٠) پیاو (١٠٠٧) ژن هـەبووە ، وە

لـه دوا تەمەنی (٣٥) ساڵیش دا ژمارەی ئافرەتان لـە ژمـارەی پیـاوان زیاتر بووە ٣ وە تەمەنی ناوەندیی ئافرەتانیش لە هۆڵندە دا گەیشتووتـە (٧٦) ساڵ ، کە چی تەمەنی ناوەندیی پیاو لەوێدا گەیشتووتە (٧١) ساڵ • وە لـە نێـوان هەر (٩٢) کەس کەتەمەنیان لەسەد ساڵ زیاتر بووە (٢٩) یان پیاو بوونو (٦٦) یانیش ئافرەت بوون • وە سەرە ڕای ئەمەش ، پیاو هەموو کاتێکی ئارەزوو بکا ناتوانێ ژن بهێنێ ، مەگەر توانایی ماڵی تەواوی هەبێ کە بتوانی جلو بەرگو خشلو کەلو پـەلی ناوماڵ بۆ ژنـەکەی بکڕێو دەرامەتی ئەوەشی هەبێ کە خاوو خێزانەکەی پێ بەڕێوە ببەرێ ، چونکە بە پلەی یەکەم هەر پیاوە لێپرسراو بەرامبەر سەر پەرشتکردنی مـاڵو خێزانـەکەی بەشـێوەیەکی ڕێكو پێك ، وە سەرەڕای ئـەمـەش زۆر جاریش وا ڕێك دەکەوێ زۆر لـە پیاوان بە بێ ژن هێنان دەمێننەوە، بـە هۆی دەست کورتیو کەم دەرامەتی کە دەبێتـە هۆی نەتوانینیان ژن لـە کاتی گەنجیان دا بهێنن • وە ئـەم جۆرە پیاوانەش ، ئەگەر ژنیش بهێنن لـە تەمەنێکی زۆر بـە ساڵا چووە ژن دەهێنن • بـەڵام ، کچان ، وانیشـە ، هەر یەکەیان کەعازەب بوو دەتوانێ شـوو بـکا بـە بێ ئـەو مـەرجو تەنـگو چەڵـەمەو کۆسپانەی کەڕێـگا لـە پیاوان دەگـرن کـە ژن بهێنن •

وە هـەروەها ڕێـژەی بـە توانایانی ژن هێنەران لـە پیـاوان دا کـەم دەکا ، وە ڕێژەی شـووکەرانی مێینەش زیـاد دەکـات • ئـەم دیـاردەیـەش زۆر ئـاشـکرایە لەو نـەتـەوانەی کـە ژمـارەی نێـرو مێینـەیان یەکسانە ، بـەڵام ، چیی دەڵێیو چۆن ئەگونجێو ئەبێ لەو نـەتـەوانـەی کـە ژمارەی مێینەیان زیاترە لـە نێرینە ؟

جـا لێرە دا زۆر باش بۆمان ئاشکرابوو کە چەند ژن هێنـان کارو

فرمانێـکی مرۆڤایەتی پیرۆزو ڕەوایە ، وەپێویستە هەمیشە نەتەوەمانی ئادەمیزاد لەسەر ئـەم زەوییە ، هەر بمێنێتـەوە ، وە هەتـا هەموو زانـاو هۆشمەندێـکی خـاوەن بیرو بـاوەڕو ئیمـانو زۆر لـە زانـا ناموسڵمانـەکانیش بە کارو فرمانێـکی ڕەواو باشی دەزانن‌و لایەنگیری لـێ ئـەکەن‌و بـە شاکارێـکی فرە چاك لـە قەڵەمی دەدەن ، بەو مەرج‌و یاسایانـەی کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ ژن هێنەرانی دانـاوە کە ئـەگەر هاتوو پەیڕەوی‌و جێبەجێی بکـەن ، چونـکە ئـەگـەر هـات‌و هیـچ پیاوێك لـە وڵاتێـکدا نەیتوانی ژنێـکی تر بهێنی ، ئـەو کاتـە زۆر لەو ئـافـرەت‌و کەورە کچانـەی بەبێ مێردو شووکردن دەمێننـەوە ، ناچار دەبن بـە دزا داخوازیـە جنسیەکانیـان لـە شـەقام‌و کۆڵانـەکانـدا بسووڕێنەوە ، چونکە هەر یەکێك لەو ئافرەتانـە کەس نیـە بیان هێنی‌و سەرپەرشتیان لێبکا ، وە هیچ کومانی تیـا نییـە ئـەو کاتـە دامێن پیسی و بـەد خوویی‌و ئـاژاوەو ناکۆکی‌و پشێوی لـە نێـوان ئـەو کۆمەڵـە دا بـەلاو دەبێتـەوە ، وە لـە هەمان کاتیش دا باری کۆمەلایـەتی ئـەو ژیانـگەیە بـە تـەواوی دەشێوێ‌و تێك دەچێ •

جـا لێرەدا پرسیارێك سەری خۆی قوت دەکاتەوەو بەرەو ڕوومان دەبێ ، کە ئـاراستەی ئـەو کەسانەی بکەین کە دژی چەند ژن هێنـان دەوەستێن‌و فرمێسکی بـە درۆ بۆ کەساسی و ستەم لێکراوی ئـافرەت هەڵدەڕێژن :

ئـایـا کامەیان باشترە بۆ ئـافرەت ـ ئـەگەر لەلای هاوسەرێـکی شەرعی بێ‌و ئـاسایی‌و پارێزگاری لـە شەرافەتمەندی ئـەو ئـافرەتـە بکاو باڵی خۆشەویستی‌و میهرەبانی بەسەرا دابگرێ و هاوبەشی خۆشی‌و ناخۆشی‌ی بێ ، وە هەموو خواست و پێداویستێکی ژیانـی ڕژانـەو

ئـارەزووی جنسی بۆ جێ بەجێ بکا باشـترە یـا خود بـە بـەرەڵایی‌و سـەرگەردانی‌و ڕیسوایی‌و بەبێ نرخ‌و ڕێزو حورمەت‌و هیچ‌و پووچی لـە شەقامەکاندا بسووڕێتـەوە ؟

بەڕاستی ئـەو کەسانـەی لایەنگیری‌و بانـگەوازی مافی ئـافرەت دەکـەن ، زۆر دوورن لەتێگەیشتنی‌و حالی بوونی واقع وواقعیەتی ڕاستی پەرستی‌و دیمانەی زانیاری فیزیولوژی‌و خواست‌و ویستی ڕاستە قینـەی ئـافرەت ، ئەگینا هەرگیز ئـەم کارو فرمانە بەکارێـکی ناڕەوا نازانن . چونـکە ئـەوەی ئـەم دەستوورو یاسەیە بـە خراپ‌و ناپەسند لەقەلـەم بـدا ، لـە ڕاستیدا ئـەو دوژمنێـکی ڕاستەو خۆی ڕاستەقینەی ئافرەتە ، نەك دۆستی بێ‌و بۆ بەرژەوەندی‌و بەختەوەری و چارەنووسی دوا ڕۆژی تێبکۆشی ، چونـکە دووربین نیەو سەیری بەرژەوەندی‌و بەختەوەری ڕاستەقینەی ئـافرەت نـاکاو بیر لـە چـارەنووسی دوا ڕۆژی نـاکاتەوە ، وە هیچ گرنـگیەك بـەوە نـادا ، ئـەگەر هاتـوو ئـافـرەت دووچـاری نارەساتێـکی ڕۆژگار بوو کۆسپ‌و تەنگ و چەڵەمە ، وەك جەلدرمەی ستەمکار ڕێـکای ژیانیان پێ تـاڵ کردو بەدبەختی‌و هـەژاری‌و پەرێشانی‌و ئاگوزەرانی ، لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێی کرد ، ئاتە ، کێ فریای دەکەوێ‌و هاو بـەشی دەردو کەسـەرو نـاخۆشی ئـەکـا ؟ ئـایـا ئـەو

نووسەری ئینگلیزی ( برتراند رسل ) دەڵێ : ( دەستووری یـەك ژن هێنان بەس لەسەر یـەك ژن هێنـان هێشتنەوە ، وە جێ بەجێ کردنی بەجێ بەجێ کردنێکی توندو تیژ ، وەستاوە لەسەر ئـەو گریمانە ، ئەگەر هاتوو ژمارەی هەردوو ڕەگەزی پیاوو ئـافرەتـان ، لـە هەر کۆمەڵێـکدا یەکسان بوون یـان لـە یەکتری نزیك بوون ، وە ئـەمەش مادام نابێ‌و گریمانێـکی نـابابی‌یـەو لـە بارودۆخی هیچ وولاتێـکدا وا نی‌یە ، وە

هێشتنەوەی یاسای یەك ژن هێنان لە هەر کۆمەڵێکدا سەردەکێشێ و دەبێتە کارێکی کوشندەو ستەم و کارێگەر بۆ ئەو ئافرەتانەی کە باری کۆمەڵایەتی وایان لێدەکات ، کە شوونەکەن و هەر بەگەورە کچی بمێنێتەوە ) •

٢ ـ بێگومان ئەو شەڕو شۆڕە بەر فرەوانانەی کە لە نێوان میللەتاندا ڕوودەدا دەبێتە هۆی لە ناو چوونی ژمارەیێکی یەکجار زۆر لە پیاوان ، هەر وەکوو لە کۆتایی جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی دا لە ئەنجامی هەڵژماردنێکدا وا دەرکەوتووە کە چەندان پیاو بەهۆی ئەم دوو جەنگەوە لە ناوچوون کە دەقەبلاندرێ بە لە ناو چوونی چەندان ملێون گەنج •

وە هەر لەجەنگی دووەمی جیهانی دا نزیکەی بیست ملێون پیاو کوژران ، وە لەهەمان کاتیش دا جگە لە چەند هەزار ئافرەتێك نەبێ نە کوژران •

G. Anquctil دەڵێ : ( لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی دا لە نێوان ساڵی ١٩١٤–١٩١٨ دا دەقەبلاندرێ ( تەقدیردەکرێ ) بەس لە فەرەنسە دا سێ ملێون ئافرەت لە پیاوان زیاتر بوون • وە لەبەر هۆی زیادەی ژمارەی ئافرەتان و کەم بوونی ژمارەی پیاوان هەندێك لە یاسادانەرەکان پێشنیاری ئەوەیان کرد کە یاسای چەند ژن هێنان دابمەزرێتەوە لە فەرەنسادا •

وە هەروەها لە ئەنجامی ئەو هەڵژماردنانەی کە لەپاش جەنگی یەکەمی جیهانی دا کراوە ، وا دەرکەوتووە کە دە ملێون ئافرەت بە بێ شووکردن مابوونەوە ، چونکە کەس نەبوو بیان هێنێ • وە هەتاکو لە پێش ئەم جەنگەش دا بەس لەیەکێتی سۆفیەتدا ژمارەی زەیادەیی

ئافرەتان لە سەر پیاواندا ( ٧٠٠ر٠٠٠ ) ئافرەت بوو ، بەلام ، لە پاش هەمان جەنگدا گەیشتە چوار ملیون ئافرەت . وە ژمارەی ئافرەتان لە ئەلمانیا دا لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا ( ٨٥٠ر٠٠٠ ) ئافرەت لە پیاوان زیاتر بوو . وە لە پاش هەمان شەڕ دا ژمارەی زیاد بوونی ئافرەتان گەیشتە دوو ملیون‌و نیو ئافرەت .

وە هەروەها ژمارەی زیادبوونی ئافرەتانیش لە سەر پیاوان لە ( نەمسا ) دا گەیشبووە نیو ملیون . وە لە هەمان کاتیشدا ژمارەی زیادەیی ئافرەتانیش لە سەر پیاوان دا لە ئیتالیاس دا گەیشتبووە زیاتر لە ملیونێك . وە ژمارەی زیادەی ئافرەتان لە ئینگلتەرەش دا نزیکەی دوو ملیون ئافرەت لە پیاوان زیاتر بوو ، وە ژمارەی ئافرەتان لە ( فەرەنسا ) شدا لە سەر پیاوان دا گەیشتبووە ڕێژە لە سەدا (١٣) .

ئاوروپا دووچاری تەنگ‌و چەڵەمەو کارەساتێکی یەکجار کوشندەو نالەبار بوو ، بەتایبەتی لەو کاتەی بەدخوویی‌و بێ‌ڕەوشتی‌و داوێن پیسی زیاتر لە پێشو لە ناو خەڵك‌و کۆمەڵگایەکەی دا بەلاو بۆوە ، ئەمەش بە هۆی ئەو ئافرەتانە بوو کە مێردەکانیان لە جەنگا دۆڕابوون ، وە یاخود بە هۆی ئەو ئافرەتانەی کە بەبێ شووکردن مابوونەوە، کەس نەبوو بیان خوازی . جا ئەو ئافرەتانە بە ناچاری لەگەڵ ئەو پیاوانەی مابوونەوە دەستیان تێکەڵ دەکردو دەستیان دەکرد بەبێ ڕەوشتی ، جا چ ئەو پیاوانە خاوەن ژن بونایە ، یاخود بێ‌ژن بونایە ، وە لێرەدا وەك دیاردەیەکی زۆر ئاشکرا کارەساتەکە دەرکەوت ، بەتایبەتی لەو کاتەی کە پیاو وازی لە ژنە شەرعییەکەی خۆی دەهێناو بە دوا ئافرەتێکی بەرەڵای تر دەکەوت . ئەمجا ئەم بارە نا ئاساییانە بوونە هۆیەکی زۆر کاریگەر کە یەکێتی ئافرەتانی ئەلمانیا

زۆر بـه پەرۆشەوە پێشنیاری پاشبینیی خۆیان پێشکەش بەمیریی‌یەکەیان بکەن کە ڕێـگا بدەن بـه چەند ژن هێنان ، چونـکە هیچ ڕێـگایەك نەبوو چارەسەری ئـەم مەسەلەیە بکا ، خەڵك ڕزگار بکا ، لەو کارەسـاتانـەی پێی کەوتوون ، جگە لـەم تاکە ڕێگایە نەبێ کـە ڕێـگا بدرێ بـە چەند ژن هێـنان •

فـەیلەسوفی ئینگلیزی ( سبنسر ) لـە پێشدا هەتاکوو بڵێی دژی چەند ژن هێـنان بوو ، وە زۆر هێرشێکی بکوژو ناڵەباری دەکردە سـەر یاسای چەند ژن هێنان ، وە هەتـا لـە ئەنجاما وای لێهات دانی پیا بنێ‌و بـە کـارێ فـرمـانێـکی فـرە ڕەواو باشی لەقەڵەم بداو ، وە زۆریش بە پیرۆزو بـە پێویستی بزانێ ، بـە تایبەتی بۆ ئـەوە نەتەوەو گەلەکەی کە تووشی داوی جەنـگ‌و شەڕو شۆڕێـکی بەردەوام دەبێ‌و ، وە زۆر لـە گەنجەکانیانـا لەنـاو دەچن •

( سـبنسر ) لـه پـەڕتووکی ( اصـول علم الاجتماع )ی دا ئەڵێ : ( ئـەگەر گۆڕینێك بەسەر نەتەوەیێك دا هاتوو پیاوانی تووشی شـەڕو شـۆڕێـکی بەردەوام بوون‌و زۆریان لـە نـاو چوون ، وە لـە هـەمـان کاتیشـدا هەر پیاوێك لەو پیاوانەی کە ماونەتەوە بەس لە سەر یـاسـای یەك ژن هێـنان مابنەوە ، وە ئەمە سەر دەکێشێ کە زۆر لە ئـافرەتەکانیان بـە بێ مێرد بمێنێنـەوە ، وە ئـەمەش دیسـان سـەر دەکێشێ بۆ کـەم بوونـەوەی زایشـگای ئـەو نەتەوەیە ، وە ژمارەشـیان یەکسـان نابێ لەگەڵ ژمـارەی مردوە کانیاندا •

وە بۆ نموونـە ئەگەر دوو نەتەوە شـەڕیان بوو ، وە لـەگـەڵ ئـەوەشـدا گریمان لـە هەموو ڕوو بارو دۆخێکی ژیانەوەو ژمـارەی دانیشتوانیان یەکسان بوون ، بەڵام یەکێـکیان سـوودی لـە هـەمـوو

ئـافرەتـەكانیان وەر نەدەگرتو ، وە ئـەوەی تریان پیاوەکانیان گشت ئـافرەتەکانیان کردبوون بـە هاوسەری خۆیان ، وە لـە ئەنجامدا ئـەو نەتەوەی کە لە سەر یاسای یەك ژن هێنان ماوتەوە لـە ناو دەچێ بەرامبەر نەتەوەکەی ترا ، کە ئـەوان چەند ژن هێنانیان لەنـاو باوبووەو سوودیان لـە هەموو ئـافرەتەکانیان وەرگرتووە ) •

٣ ـ هـەر وەکوو دیاردەیەکی ئـاشـکرایە ، لـە نێـوان هەموو میللەتو نەتەوەیێـکدا وارێك دەکەوێ ئـافرەت نەزۆك دەبێو ، وە لـە هەمان کاتیشدا مێردەکەشی زۆر ئـارەزوومەندی منال دەبێو حەز دەکا منـاڵـی ببێ ، وە لەم حاڵەتەدا دوو رێـگا لـە پێش کابرا دا هەیە :

١ ـ یـا دەبێ دەست لـە ژنەکەی هەڵـگرێو تـەلاقی بـدا ، وە هـەڵسـێ ژنێـکی تر بهێنێ ، بەهیواو ئـاواتی ئـەوەوە کە منـاڵی بۆ بهێنێو وجاغی کوێر نەبێ •

٢ ـ یان ژنـە نەزۆکەکەی لەلای خۆی بهێڵێتـەوە ، وە هـەستێ ژنێـکی بەسەردا بهێنێ • بێ گومان مانـەوەی ژنەکە لەلایان مێردەکەیەوە زۆر باشترە وە هەتـا بە هیچ جۆرێك بەراورد ناکرێ ، لەگەڵ ئـەوەی لـە تـەلاق بدرێو بەسەرگەردانیو سەر لێشێواویو ناومێدی ، سەر دەمێ لـە ماڵی برایکی یـا خزمێکی بسوورێتـەوە ، چونـکە ئـەگـەر مێردەکەی پیاوێکی موسڵمانی خوایی خاوەن ئیمانو دادپەروەربێ ، هەموو مـاف و نـازو رێـزو حورمەتێـکی ھـەر وەکوو پێشو دەپارێزیو هیچ جیاوازێکی لەگەڵ ژنـە تازەکە ناکاو ، بەچاوی یەکسانیو دادپەروەری ، سەیریان دەکاو رەفتاریان لەگەڵ دەکا • وە ئـەو کاتـە هیچ ناکۆکیو نـاژاوەو پشێوییەك لـە نێوان ئـەو دوو ئـافرەتە روو نادا ، چونـکە وەك یـەك سەیر دەکرێن لـە لایەن هاوسەرەکەیانـەوە ، وە ئـەوەی

ئـەدرێ بەژنی یەکەم ، ئـەدرێ بـەژنی دووەم • ئەوجەلە ، ئـەو دوو ئـافرەتـە وەك دوو خوشـکی زۆر خۆشەویستو دڵسۆز ، لەگەڵ یەکا بـە سەری دەبەنو دەژین ، هەر وەکوو وا دەگێڕنەوە کە زۆر جار وا ڕێك کەوتووە ، پیاوێك دوو ژنی هێناوە ، وە ئـەو دوو ئـافرەتە ، زۆر بەخۆشیو شادیو کامەرانیو ئـاسوودەیی ، لەگەڵ یەکا بـە سـەریان بردووە ، وە هەتاکوو لەکاتی بانـگ کردنی یەکترا ، بـە ووشەی ( ئەی خوشکم ) بانـگی یەکتریان کردووە • وە هـەر وەکوو وادەگێڕنـەوە – وولاتی لبنان پیاوێك ، هەڵدەستێ ژنێك دەهێنی ، وە لـە پاش ماوەیەك بۆی دەردەکەوێ کە ژنەکەی نەزۆکە ، وە هەڵدەستێ لەگەڵ ژنـەکەی ڕێك دەکەوێ کـە ژنێـکی تر بهێنی ، بەشکو خوا نـەوەیەکی بداتێ •• کابرا ژنێـکی تر دەهێنی ، بـەڵام بـە هیچ جۆرێك هیچ جیاوازییـەك لـە نێوانیان نـاکـا وە رۆر بە دادپەروەریو یەکسانی ڕەفتاریان لەگەڵ دەکـا • وە لەبەر ئـەمـە ئـەو دوو ئـافرەتە ، وەکوو دوو خوشکی زۆر خۆشـەویستو دڵسۆز پێـکەوە گوزەران دەکەنو دەژین • لـە پاش ماوەیەك ژنی تـازە کوڕێـکی دەبێ • وە بـە هەر دووکیان زۆر گرنگی بـە پەروەردەکردنو بە خێوکردنی منداڵەکە دەدەن ، هەتاکوو ژنەکەی یەکەم ، زیاتر لـە دایکی منداڵەکە گرنگی بـە پەروەردەکردنی کوڕەکـە دەدا • وە پیاوەکە لەپاش ماوەیەك دا دەمریو ، ئـەو دوو ئـافرەتە پاش مردنی مێردەکەیان ، وەك دوو خوشکی زۆر خۆشەویست ، لەگەڵ یەکا دەژینو ، وە لەگەڵ یەکتریا هەرگیز جیا نابنەوە • وە هۆی ئـەمـەش ، هەموو دەگەڕێتەوە سـەر دادپەروەریو ئیمانـداریەتی مێردەکەیـان •

جا ئـەی برای خوێنەرو ڕەخنەگر ، لەمکاتە دا مرۆڤ ناچار دەبێ کـە لـە ژنێك زیاتر بهێنی ، ئەگەر هاتوو ژنەکـەی نـەزۆك بوو ، بۆ

بەرزەوەندی خۆیو کۆمەڵ ، خۆ ئەگەر هەموو ئەو موسڵمانانەی کە لە ژنێك زیاتر دەهێنن ، وەکوو ئەو کابرا دوو ژنهێنەرەی خەڵکی ( لبنــان ) بن چ زیانو خراپەیێکی هەیەو چ زیانێك بە ژنی یەکەم دەگەیەنێ ، زیاتر لە سوودو قازانجو بەرزەوەندی خێزانو کۆمەڵ نەبێ • ئینجا ئەگەر ژن هێنەران بە تەواوی پەیرەوی یاسا پیرۆزەکەی ئیسلام بکەن ، لام وایە هیچ خراپەو خراپەکاری‌یەك لە چەند ژن هێنــان ڕوو نــادا ، بەڵام ، ئەگەر هاتوو ئەو ژن هێنەرانەی هەڵدەستن چەند ژنێك دەهێنن پەیرەوی دەستووری پیرۆزی ئیســلام نــاکەنو ، دادپەروەری‌و یەکسانی لە نێوان ژنەکانیان نــاکەن ، ئەمە تــاوانو گونــاحی ئیسلام نی‌یە ، بەڵکوتاوانی خۆیانە کە پەیرەوی یاسای ئیسلام نــاکەن ، وە ئەو کاتــە هەر بۆشیان نی‌یە کە چەند ژن بهێن بەپێی دەقی فــەرمووده‌ی خواوەند کە دەفەرمووی : ( فان خفتم الا تعدلوا فواحدة )• واتــە : ئەگەر ترستان هەبوو لەوەی کە دادپەروەری‌و یەکسانیتان لــە نێــوان ژنەکانتان پێناکرێ ، لەیەك ژن زیاتر مەهێنن •

لێرەدا خوێنەر دەپرسی‌و دەڵێ : بەڵێ خۆ ئەگەر ئەم نموونەیــە ڕاست بێ‌و ڕووی دابێ ، زۆر بەکەمی وا ڕێك دەکەوێ کە پیاوی چەند ژنهێنــەر ، ئەوها دادپەروەر بێ ، وە دوو ئافرەتە ئەوها پێکەوە بتوانن بە بێ ئــاژاوەو شەڕو شۆڕو پشێوی ، لەگەڵ یەکترا پێکەوە بگونجێن‌و گوزەران بکەن • وە زۆر جار وا دەبێ ئەو دوو ژنــە ماڵەکەیــان لــە خۆیان‌و مێردەکەیان دەکەن بــە دۆزەخ ، وە هەتا زۆر جاریش دەیکەن بــە شەڕو ئــاژاوە لــە ماڵەوە ، وە دەست لــە قــژی یەکتریــا دەنێن‌و گشت خەڵــکی کۆڵان لــە خۆیان کۆدەکەنــەوە ••• وە زۆر جاریش مێردەکەیان کە بــە سەر ئەو هەراو هۆریاو شەڕو ئــاژاوەیە دا دێتەوە ،

لـە ڕقو قینو ئـەزمەنـا ، دەست دەکا بە لێدانو کوتانیانو جاریش وا دەبێ یەکێـکیان یا هەر دووکیان تەڵاق دەدا ...

جا لێرەدا کارەساتو تەنگو چەڵەمەو ڕەش بینایەتیی ، لـە نێوان خێزانێـکدا دەست پێ دەکا .. ژنەی تەڵاق دراو هەڵدەستی لـەگـەڵ منداڵـەکانیـەوە ، دەچێتـەوە ماڵێ باوکی‌یەوە ، لەوێشدا پاش ماوەیێـکی کەم ، ئـەوانیش زۆر جار وادەبێ لـە منداڵـەکانی بێ تاقـەت و بـێزار دەبنو زۆر لـە دایکەکەیان دەکەن ، کە منداڵەکانی بـە سەر باوکەکەیان دابداتەوە ... جا دایکەی داماوو دڵ بەخەم ، نـازانی ڕوو لـە چ لایێك بکاو ، چی بڵێو چی بکا .. ئـەگەر لـە لای خۆی دەیان هێلیتەوە ، دڵی باوکیو براکانی لێ‌ی دێشیو بەخۆشی ناتوانی بەخێویان بکات ، وە ئەگەر بەسەر باوکیشیان دادەداتەوە ، خراتر لـە پاشترە ، چونکە مەترسی بێ نـازیو بەرەڵایی‌و لـە نـاوچوونیان لێ دەکات ..

بـەڵـێ ، ئـەمانـە هەموویان ڕاستن ڕوویان داوە ، بەڵام ، ئـایـا دادەدرێتەوە و دەبنە قۆچی قوربانی ، لە پێناو هەوەسو ئارەزووماندایەتی بـاوکیـان ، سـەبـارەت بـە چەند ژن هێنـانی ..

بـەڵـێ ، ئـەمانـە هەموویان ڕاستنو ڕوویان داوە ، بەڵام ، ئـایـا ئـایینی ئیسلام بەم جۆرە ڕێگای داوە بـە چەند ژن هێنەران ، ئـەوهـا ڕەفتارو کرداریان بێ لـەگەڵ هاوسەرەکانیان ، وە ژنی یەکەمو منداڵەکانی سەرگەردانو سەر لێشێواوو پەرتو بڵاو وپچڕ پچڕ بکەن ؟ یـا خـود ڕێـگای داوە بۆ مەبەستێـکی تایبەتی ئـەوتۆ کە بۆ بەرژەوەندیو سوودو قـازانجی خێزانەکە بێ ، نەك بۆ تێـکچوونو ئـاژاوەو سـەرگەردانی خێزانەکە بێت . وە هەروەها ئـایینی ئیسلام هەر بـە گوترە ، ڕێـگای چەند ژن هێنانی دانەناوە ، بەڵـکو دەستوریشی بۆ ئـەم ڕێگایە دانـاوە .

ئەمجا ئەو ژن هێنەرانەی پەیڕەوی ئەو دەستوورە ناکەن و ئەمە ڕەفتارو کرداریان بێ بەرامبەر ژن و منداڵەکانیان ، ئەو کەسانە بە ڕاستی زۆر دوورن لە ئیسلام و ، ئیسلامیش زۆر لێیان دوورە ، هەر وەکوو ئاسمان و ڕێسمان ، با هەر چەندە خۆیان بە ئیسلام دابنێن و نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن و زەکات لە ماڵیان دەربکەن و سەردانی ماڵی خوا بکەن ، ئێمە دەڵێین ، ئەگەر ئەمە ڕەفتارو کردەوەیان بێ ، بەرامبەر ژن و منداڵەکانیان ، زۆر تاوانبارو سەر لێ شێواون ، چونکە بەستەمکار لە قەڵەم دەدرێن بەرامبەر خێزانەکانیان ، وە خواوەندیش ڕقی لەهەموو ستەمکارێکە •

٤ ـ گەلێ جار وا ڕوودەدا ئافرەت تووشی نەخۆشییەکی زۆر بکوژ و نالەبار دەبێ ، کەوا لەمێردەکەی دەکا بە ناچاری بە هیچ جۆرێك نەتوانی لێی نزیك بێتەوە ، بۆ جێ بەجێ کردنی ئارەزووی جنسیەکانی ، ئەم کاتە پیاوەکە ئەم دوو ڕێگایەی لەپێشە کە بەرامبەر ژنەکەی بیکا :

١ ـ یا دەبێ ژنەکەی تەڵاق بداو ژنێکی تر بهێنێ • وە ئەم کارو ڕەفتارەش کارێکی ناڕەواو ڕاست نی یە ، وە هیچ ویژدان و نمەك و وەفایەك نی یە کە شیاو بێ پیاوەکە بەرامبەر هاوسەرەکەی بەکاری بهێنێ ، ئەو هاوسەرەی نەوتۆ کە ماوەیێکی زۆر لە هەرەتی تافی گەنجایەتی لەگەڵی ڕابواردووە ، وە هیچ لە بەرژەوەندی ئافرەتەکەش نی یە کە تەڵاق بدرێ و بەسەر لێ شێواوی و سەرگەردانی و داماوی لەلایان خزم و کەسانی بسووڕێتەوە ، وە نەخۆشی یەکەی لە بری ئەوەی لەسەری سووك بکرێ ، ئەوەندەی تر لە سەری کوشندەو گرانتر بکرێ ، تا ماوە هەر لەبەری بناڵێ و بە ژیانێکی کولەمەرگی بژی •

٢ ـ یاخود هەڵسێ ژنێکی تر بە سەر ژنەکەی بهێنێو ژنی یەکەم لەژێر چاو دێرێو ئاگاداری خۆی بهێڵێتەوەو دەستی کۆمەڵو یارمەتی بۆ درێژ بکا ؛ وە باوەشی خۆشەویستیو میهرەبانی ژنو مێردایەتی بۆ بکاتەوە ، ناموس‌وشەرەفو ڕێزو حورمەتی بپارێزی ، لە ژیانی کولەمەرگیو ناخۆشی ڕزگاری بکا ، نەخۆشیو دەردی لە سەر سووك بکا ، هیچ جیاوازی یەکی لە گەڵ ژنەکەی ترا نەکا • لەم بارەدا ، ئەگەر پیاو هەڵسێ ژنێکی تر بهێنێ چ خراپەو خراپەکارێکی لێ ڕەچاو دەکرێ ؟

ئایا ئەمە کارێکی ڕاستو ڕەوایە ، یا نادروستو ناڕەوایە ؛ وە لە بەر چی ؟ وە ئایا پیاوەکە لەم بارەدا ( حاڵەتەدا ) هەروەها بمێنێتەوەو بچێ بەدوا ئافرەتانی خراپ بکەوێ بۆ جێ بەجێ کردنی ئارەزووی جنسیەکانیو کۆمەڵ پیس بکا بشێوێنی ، یاخود ژنێکی شەرعی بهێنێو لەگەڵی ڕابوێرێو هیچ جیاوازی یەك لە نێوانیان نەکاو بە یەکسانی ڕەفتاریان لەگەڵ بکا ، باشترە ، یاخود هەروەها بمێنێتەوە ؟

جا لێرەدا ئەگەر مرۆڤ خۆی نەخەڵەتێنێو دوای لاملێو سەر لێشێواویو گومرایی نەکەوێو لەڕوانگەی ڕاستی پەرستی بیرساو دادپەروەریو مرۆڤایەتی‌یەوە بیر لەم کێشەیە بکاتەوە ، دان پیا دادەنێو دەسەلمێنی کە چەند ژن هێنان لەم بارانەدا (حاڵەتانەدا) هەنگاوێکی یەکجار زۆر پێویستو پیرۆزو کارێکی فرە ڕەواو دروستە ، هەم بۆ بەرژەوەندی ژنەکەو هەم بۆ پاك داوێنیو شەرەف مەندایەتی پیاوەکە •

٥ ـ زۆر جار وا دەخوازێ ، کە پیاو بۆ گەشتێکی دوور بڕواو ماوەیێکی زۆر لەوێدا بەناچاری بمێنێتەوە ، وە هەروەها نەشتوانێ ژنەکەی لەگەڵ خۆی ببەرێ • وە بەبێ ژنیش نە توانێ ئیدارەو گوزەران بکا • جا لێرەدا چارەی ئەو کابرایە چی‌یەو چی بکا باشە ؟

**لێرەدا دوو ڕێگای لە پێشە :**

١ ـ یا دەبێ لەگەڵ ئافرەتێکی دامێن پیسی ناشەرعی ڕابوێری کە نەژنەکەو نە منداڵەکانی هیچ مافێکی ژنایەتی و باوکایەتیان لە سەر پیاوەکە نابێ •

٢ ـ یاخود ژنێکی شەرعی بەشەرەفو ناموسو پاك دامێن بهێنی ، کە هەمو مافێکی خۆیو منداڵەکانی لەسەر پیاوەکە بێو بەسەر بڵندیو خۆش گوزەرانیو ئاسوودەییو کامەرانی پێکەوە بژین •

**ئایا ئەمە چارەیێکی ڕاستو دروستە ؟**

یاخود بە دامێن پیسی هەر ڕۆژێ لەگەڵ ئافرەتێکی بەدخوو بێ نرخ ڕابوێری باشە ؟

٦ ـ زۆر جار دەبێ هەندێك لە پیاوان ئارەزووی شەهوەتی جنسیان یەکجار زۆر بەهێز دەبێ ، کە وایان لێدەکا کە بەژنێك ئارامی شەهوەتی جنسیان پێی دانەمرکێ ، چونکە لە درێژایی ساڵدا زۆر ڕۆژ هەنە کە پیاو ناتوانێ نزیکی ئافرەت ببێتەوە ، بە تایبەتی لە ڕۆژانی بێ نوێژیدا کەدووحەفتە دەخایەنی • وە ئەگەر خۆ منداڵیشی بوو ئەوە تا ماوەی چل ڕۆژ یا زیاتر پیاوەکە بۆی نییە بە هیچ جۆرێك نزیکی ژنەکەی ببێتەوە بۆ جیماع کردن ••• خۆ ئەگەر تەمەنی ئافرەتیش کە گەیشتە پەنجا ساڵی ئەو کاتە ئارەزووی جنسی یەکجار زۆر کەم دەبێتەوە ، وە وەکوو لە پشووێکی نیمچە ڕەسمیهەمیشەیی دابێ وایە !

جا لەم حاڵەتانەش پێویست بە چارە سەرکردنێکی ڕاست و

ڕەواو دادپەروەرانە ئەکا بۆ ئەوەی پیاوەکە تووشی داوی دامێن پیسی و بەد ناوی نەبێ . ئەمجا پیاوەکە چی بکا باشە ، ئەگەر هاتوو خۆی پێ نەگیرا ؟

ئایا دەست لەگەڵ ئافرەتێکی ناشەرعی ناپاکو دامێن پیس تێکەڵ بکا ، کە ئەو ئافرەتە هیچ مافو پەیوەندیەکی شەرعی بەسەر پیاوەکەوە نابێ ، وە نە ئەو منالانەی لێشی ئەبن ، هیچ مافو هەقێکی شەرعیو ڕەوایان بەسەر پیاوەکەوە نابێ ؟ یا ئافرەتێکی شەرعی دامێن پاکو خاوەن خوو ڕەوشتێکی بەرز بهێنێ ، کە مافو ناموسو گشت هەقێکی خۆیو منالەکانی لە لایەن پیاوەکەیەوە بپارێزرێ ؟

لێرەدا بۆمان ئاشکرا بوو ، کەوا لەم باری ناکاوییەدا ، ئەگەر پیاو هەڵسێ چەند ژنێك بهێنێ ، هیچ خراپە کارێکی لێ ڕوونادا ، بەڵکو لە خراپەکاریو دامێن پیسی دەپارێزی ، ئەگەر پەیڕەوی یاسای شەریعەتی ئاینی ئیسلام بکاو خۆی لێ گێلو نەفام نەکا ، وە لەهەمان کاتیشدا پەیامداری لەگەڵ هاوسەرێکی شەرعی پاك دامێنو ڕەوشت بەرزی هاوشانی خۆی، دەبەستێ . وە ئەگەر بیەوێ دەشتوانی بە دادپەروەری ڕەفتار لەگەڵ گشت هاوسەرەکانی بکاو ، وە بەچاوێکی یەکسانیش سەیری هەموویان بکاو ، هیچ جیاوازییەکیان لە هەموو بارێکەوە لەنێوانیان نەکا .

٧ ـ دیاردەیەکی ئاشکرایە کە جیاوازیێکی زۆر لە نێوان ماوەی پیتێتی (چاككردنی) نێوان پیاوو ئافرەت دا هەیە ، ماوەی پیتێتی لە پیاو دا تا ساڵی حەفتا یا زیاتر دەخایەنی ، کە چی لە ئافرەتدا لە پەنجا ساڵی زیاتر تێنا پەڕێ ، ئەم ماوەیەش کەم نییە ، وە هیچ شتێکیش نییە کەلێنی ئەم شوێنە بگرێتەوە ، بە تایبەتی بە نیسبەت ئەو پیاوانەی

کـە حەز لـە منالّو نـەوە زیاتر دەکەنو ، ژنەکانیشیان لـە منالّ بوون وەستاونەتەوە • جا کە شەریعەتی خوایی پیرۆزی ئیسلام کە لەم حالّەتەدا

ڕێـگای چەند ژن هێنانی داوە ، بە بێ هوودەو سوودەو قـازانج نی‌یە ، بەڵـکو بۆ چارەسەرکردنی دەردی کوشندەی کۆمەڵە ، بە باشترین ڕێگاو بەچاکترین شێواز کە بتوانێ بە ئاسانترین چارە ، ئـەو تەنـگ‌و چەڵەمەو گیرو گرفت‌و کارەساتانەی کە بەرەو ڕووی خەڵك دەبن ، لـە مـاوەی ژیانیانـا چارەسەریان بکاو ڕزگاریان بکا ، لـە ژیانی کولەمەرگی‌و ڕەش بینایەتیی •

جـا هەر لـە بەر ئـەو هۆیانەیە کە چەند ژن هێنان کارو فرمانێکی ڕەواو دروست‌و پێویستە ، بەو مەرج‌و دەستوورانەی ئـایینی ئیسـلامی پیرۆز ، بۆ ژن‌هێنەری دانـاوە ، ئـەگەر پەیڕەوی بکاو خۆی لێی گێل‌و کەودەری‌و نەفام نەکا • ئەگینا وا باشترە ، هەر لەسـەر یەك ژن هێنـان بمێنێتـەوە تـا نـە خۆی تاوانبار بکاو ، نە ئەو ئافرەتانەی کە بوونـەتـە هاوسەری‌و ژیانیان لێ‌تاڵ بکاو ، بیان چەوسێنێتەوەو دەسـتی سـتەم‌و ستەمکاری‌یان بۆ درێژ بکا • ئـافرەت سپاردەیێکی خوایە لەلایەن پیاوەوە، پێویستە زۆر ڕێزی لێ‌بگیرێ‌و هەرگیز نەخرێتـە پشت گوێ‌و بەچاوێکی سـووك سەیری نەکرێ •••

لێرەدا ئەگەر گەشتێك بـە نـاو فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەرمان (محمد درووودی خوای لێ بێ بکەین ، بە تایبەتی ئەو فەرموودانەی کـە دەربـارەی باش جوولانـەوەو ڕەفتـارو دادپـەروەی‌کـردن لـەگـەڵ ئافرەت‌کردن بکەین ، زۆر باش بۆمان ئاشکرا دەبێ کە تـا چ ڕادەیەك پێغەمبەری ئیسلام گرنگی بە باش ڕەوشت‌کردن لەگەڵ ئـافرەتـا داوە ، هـەر وەکوو فـەرموویەتی :

« الصلاة الصلاة وما ملكت ايمانكم لا تكلفوهم ما لا يطيقون ، الله الله في النساء فانهن عوان في ايديكم ـ اي أسراء ـ أخذتموهن بأمانة الله واستحللتم فروجهن بكلمة الله » .

وه هەروەها لـه فـەرموودەيـەكى تريشـدا فـەرموويـەتى .

« من كان له امرأتان فمال الى احداهن دون أخرى – وفي رواية – ولم يعدل بينهما ـ جاء يوم القيامة واحد شقيه مائل » .

ئـەمجا خۆ ئـەگەر خوێنـەر بـە باشى سەرنج بداتە ، ئـەم دوو فـەرموودەيەى پێغەمبەرمان ، باش بۆى ئاشكرا دەبێ كە تـا چرادەيەكى يـەكجار زۆر پێشـەوامـان گـرنـگى داوە بـە بـاش جوولانـەوەو دادپەروەرى كردن لەگەڵ ئافرەتاندا ، هەر وەكوو فەرموويەتى : ( ئەوانە وەك بەندەيەك وانـە لـە لابەن ئێوەوە ، وە ئەوانە سپاردەى خواوەندن دراونەتە دەست ئێوە ، بە فەرمانى خوا جيماع كردن لـەگـەڵيـان حەڵاڵ بووە بەهۆى مارەكردنيان ، جا لەگەڵيان باش بن و ستەميان لێ مەكەن ) . وەهەروەها لـە فەرموودەى دووەميش دا فەرمووى : ( هەر يەكێك دوو ژنى هەبێ و يەكسانيان لـە نێوان نەكا ، لـە رۆژى قيامەت دا بـە خوارى و شەپرە لێدراوى دێت ) . وە هەروەها سـەروەرى ئيسلام ، هەتـا لـە يەكسانى خۆشەويستى نهێنێ دەروونيش دا خۆى پاراستووەو بۆزشـى لـە خوا خواستووە كە لە خۆشەويستى دەروونى دڵيەوە سـەرزەنشتى نەكا ، چونكە لەوزەو تواناى هيچ ئـادەميزادێك دا نىيە كە بتوانێ وەك يـەك هـەموو ژنـەكانـى خـۆش بووێـن ، وەكـوو دەفـەرمـووێ :

« اللهم هذا ( اي العدل في البيات ولعطاء ) جهدي فيما أملك ولا طاقة لي فيما تملك ولا أملك ) ، يعني الميل القلبي » .

واتـە : پەروەردگارا ، ئـەوەندەم لـە دەسەڵات و توانـا دا هەيە ،

که بەرامبەر هاوسەرەکانم بکەم ، چ لە چوونەلای شەوانە دا یا لـەپـێ بەخشینی کەل‌و پەل‌و پێداویستی ڕۆژانەدا بە یەکسانی لەگەڵیان ڕەفتـار بکەم ، بەڵام ، هیچ توانـاو دەسەڵاتێکم نی‌یە لەوەی دا کە بەدەست تۆیە، وە خۆشەویستی دڵیشم هیچ بە دەست خۆم نی‌یە ، ئـەگەر یەکێـکیانم لەوانیتر خۆشتر بووێ بەڕاستی لـە ئەنجامی ئـەم لێکۆڵینەوەیەدا ، زۆر بـە باشی دادپەروەری ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەرامبەر ئـافرەتاندا بۆمان ئـاشـکرابوو ، کە تـا چ ڕادەیەك یاسای پیرۆزی ئیسلام گرنـگی بـە ئـاگاداری کردن‌و باش جوولانەوەو دادپـەروەری کردن لـە نێــوان هاوسەراندا داوە ، کە هەرگیز جڵەوی ستەم‌و ستەمکاری بۆ پیـاو درێژ نـەکردووە ، کە ئـافرەتی پێ‌بچەوسێنێتـەوە ، وە هەتـا لـە سـەری پێویست‌کردووە کە لەگەڵ ژنـەکانی باشـی بێ‌و هیچ‌جیاوازی‌یەك نـە نێوانیاندا نەکا ، هەتا لـە چوونەلای شەوا دەبێ بە نۆرە ، هـەر شـەوە زۆر بەڕێك‌و پێـکی بچێتـە لایان ، وە ئـەگـەر شـتێکی بۆ یەکێـکیان کڕی ، دەبێ بۆ ئـەوەکانی تریش بکڕێ ، وە هەتا نابێ بـە هیچ جۆرێك خۆی واپیشان بدا کە یەکێـکیانی لـە وانیتر خۆشتر دەوێ ، نـەوەك هەست بەوە بکەن کە جیاوازی‌یان لـە نێوان دەکا . ئەمجا ئـەگـەر پیاو هاتوو ئـەوها بەدادپەروەری‌و یەکسانی ئاکاری لەگەڵ خێزانەکانی‌کرد ، لام وایە چەند ژن هێنان،هیچ خراپەیەك ناگەیەنی‌و نابێتە ناکۆکی‌و ئاژاوەی ـ ان هیچ خێزانێك . بەڵام ، ئەگەر پیاوە چەند ژن هێنەرەکە دادپەروەر نەبوو ، وە بە یەکسانی ڕەفتاری لەگەڵیان نەکرد ، بێ گومان ئـەو کاتـە هەر خۆی دەبێتـە نانـەوەی هۆی ئاژاوەو نـاکۆکی‌و پشـێوی نێـوان خێزانەکەی ، چونـکە ئەگەر هاتوو کەمێك یا زۆر هەستیان بەوەکرد کە یەکێـکیان لـە وانی‌تر خۆش‌تر دەوێ ، خۆ ئەوکاتە ، جیهانی ڕەوشتیان لـێ دەبێتـە تاریکەستان ؤ هۆش‌و ئـەقڵیان لـە لای خۆیـان نامینێ و ،

هەموو ڕقیان لە ژنەکە دەبێتەوەو لە گەڵی دەکەن بە شەڕو فەرتەنەو ئاژاوەو شەڕە جنێو ... جا تەوەرەی سەرەکی هەر خێزانێك بە پلەی یەکەم هەر پیاوەکەیە ، ئەگەر هاتوو پیاوێکی بە ویژدان و هۆشمەندو دادپەروەر بوو ، ئەو کاتە خێزانەکەی دەتوانێ بەو پەڕی خۆشیو کامەرانیو شادیو بەختەوەریو ئاسوودەیی بژین ، خۆ ئەگەر هاتوو مرۆڤێکی دادپەروەر نەبوو ، ئەو کاتە هەر خۆی دەبێتە تەوەرەی بنچینەیی سەر لێشێواندنی نێوان خێزانەکەی . وە هەتا ئەگەر هاتوو پیاوێك یەك ژنیشی هەبوو ، بەڵام ، لەنێوان منداڵەکانی دا یەکسانیو دادپەروەری نەدەکرد ، وە یەکێکیانی لەوانیتر خۆشتر دەویست ، جا هەر کاتێك کە منداڵەکانی تر هەستیان بەو جیاوازییە کرد ، هەموو ڕقیان لە براکەی خۆیان یا خوشکەکەیان ، وە هەتا لە باوکەکەشیان دەبێتەوە . زۆر جار لە سەر ئەم ڕەفتارە ناڕەوایە لێیان دەبێتە شەڕو ئاژاوەو پشێوی .

لێرەدا ئەبێ باوك ، وەك مامۆستاو پێشەواو ڕابەرێکی زۆر دووربینو زاناو لێهاتوو بێ ، بە هیچ جۆرێك وانەکا کە یەکێك لەخێزانو منداڵەکانی هەست بەوە دەکەن ، کە جیاوازی یەکێکیان لە سەر ئەوانیتر دەکا ، تا ببێتە پێشەوا و ڕابەرێکی ڕاستەقینەو بە توانای ئەوتۆ کە بتوانێ ڕێ نومایی خێزانەکەی بکا .

# چۆن مافی ئافرەت لە ڕژێمی ئیسلام دا پارێزاوە

## ( ١ )

هیچ پێویست بە بەڵگە هێنانەوە ناکا ، ئەگەر بڵێین ئافرەت لە ڕژێمی ئیسلام دا ، وەك گیان لەبەرێکی ئادەمی پارێزراوەو سەیر دەکرێ ، کە گیانێکی ئادەمی وەك جۆری گیانی پیاوی هەیە ، بەبێ هیچ جیاوازی‌یەك ، هەر وەکوو لە قورئانی پیرۆزدا خوا فەرموویەنی: « يا أَيُّها النَّاسُ اتقُوا رَبَّكُم الذي خلَقكُم مِنْ نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منها رجالاً كثيراً ونساء » ، ( سورة النساء ـ الآية : ١ ) •

واتە : ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن لە ئازارو لە نافەرمانی پەروەردگاری خۆتان • ئەو پەروەردگارەی کە ئێوەی دروست کردووە، لە یەك کەسی تەنها کە ناوی ئادەمە بەو بۆ چوونە کە بە تەنیا ئەو باوکی هەمووتانە • وە دروستی کردووە ، لەو کەسە تەنیایە هاوسەرەکەی کە دایکە (حەوا)یە • وە بڵاوی کردوە لەو دوو کەسە پیاوانێکی زۆر وژنانێکی زۆر •

کەواتە لە ڕژێمی پیرۆزی ئیسلام دا هیچ جیاوازی‌یەك لە ڕاستی دا لە نێوان پیاوو ئافرەت دا نی‌یە ، چ لە جۆری ئادەمیزادیەتیاندا ، وە یا لە ڕەگەزو بنەچەی دروست بوونیاندا • وە هەروەها لە گشت مافی کۆمەڵایەتیاندا ، وەك یەك سەیر کراون چ لە دەست درێژنەکردنە سەر ناموس‌و شەرەف‌و ماڵ‌و خوێنیان • وە هەروەها لە ڕێز گرتن‌و

کەرامەت‌و حورمەت پاراستنیان ، وەك یەك بە یەکسانی مافیان پارێزراوە، هەر وەك چۆن ناشێ لە پاش ملە باسی پیاو بەخراپە بکرێ ، هەروەها ناشێ باسی ئافرەتیش بکرێ ، وە هەر وەك نابێ سیخوری لە سەر پیاوبکرێ ، هەروەها نابێ لە سەر ئافرەتیش بکرێ ، وە هەر چۆن نابێ بەبێ ئیزن وەرگرتن لە پیاو کەس پێ لەناو حەرەمی ماڵەکەی دابنێ ، هەروەها هەمان ماف بۆ ئافرەتیش پارێزراوە • وەکوو خوا لە قورئاندا دەفەرمووی :

« یا أیها الذین آمنوا لا یسخر قوم من قوم عسی ان یکونوا خیرا منهم ولا نساء من نساء عسی أن یکن خیرا منهن ، ولا تلمزوا انفسکم ولا تنابزوا بالالقاب » ( سورة الحجرات ـ الآية : ١١ ) •

واتە : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان بەیەزدان هێناوە گاڵتەو قەشمەری بەیەکتری مەکەن ، چونکە لەوانەیە ئەوەی گاڵتەی پێ نەکرێت باشتر بێت لەوەی گاڵتەی پێ دەکا ، وە عەیب‌و شوورەیی لە یەکتری مەگرن ، وە ناوو ناتۆرە لە یەکتری مەنێن ، چونکە ناوو ناتۆرە نان لەیەکێ کە باوەڕی هێناوە ڕەفتارێکی زۆر ناشیرین‌و خراپە ، ئەوانەی پەشیمان نەبنەوە لەو ڕەفتارە خراپانەیان ستەمکارن‌و دوو چاری سزای خواوەند دەبن •

وە هەروەها خوا دەفەرمووی :

« ولا تجسسوا ولا یغتب بعضکم بعضا » ، سورة الحجرات ـ

واتە : ئێوە سیخوری لە سەر یەکتری مەکەن ، وە لە پاش ملە بە خراپە با هەندێکتان باسی هەندێکتان (مەکەن) • وە هەروەها خوا لە سوورەتی نووریش دەفەرمووی :

« يا أيها الذين آمنوا لا تدخلوا بيوتا غير بيوتكم حتى تستأنسوا وتسلموا على أهلها » ، ( سورة النور ـ الآية : ٢٧ ) •

واتـه : ئـەی ئـەو كەسانەی بڕواتـان بـە خوا هێناوە ، جگە لـە مانی خۆتـان مەچوونە ماڵی هیچ كەسێكەوە تـا ئیزنیان لێ وەرنـەگرن ، وە ئەگەر ئیزنیان دان ئەم كاتە بچنە ژوورەوە ، وە كە چوونە ژوورەوش، سـلاو لـە خەڵـكی ماڵەكە بـكەن •

وە هـەروەهـا پێغـەمبەریش فـەرموویـەتی :

( كل المسلم على المسلم حرام ، دمه وعرضه وماله ) •

واتـە : هەموو شتێكی موسڵمان لـە موسـڵمان حرامـە ؛ خوێن و ئـابڕو و ماڵـی ) •

## ( ٢ )

### ( یەكسانی پیاوو ئافرەت لە پاداشتی دوا ڕۆژ دا )

بـە ڕاستی ئـەگەر مرۆڤی خوێندەوارو ڕۆشنبیر ، كەمێك سەرنج بداتـە ئـەو ئـایەتانەی كە دەربارەی یەكسانی نێوان ئافرەت و پیاو ، لـە پاداشتی دوا ڕۆژا هاتوونەتە خوارەوە ، بـە باشی بۆی ئاشكرا دەبێ كە یەكسانیو دادگەری ڕاستەقینەی ڕژێمی ئیسلام كە تا چ ڕادەیەك پیاوو ئـافرەت ، وەك یەك بـە هاوسەنـگی یەكتری لەتای تەرازووی یەكسانی دا نراون ، هەر وەك خوا دەفـەرمووی :

« فاستجاب لهم ربهم أني لا أضيع عمل عامل منكم من ذكر أو انثى بعضكم من بعض » ( سورة آل عمران • الآية : ١٩٥ ) •

واتــه : جا خوای مــه‌زن داواکه‌یانی گیراکردو دڵخوازه‌که‌یانــی بــه جێ هێناو فه‌رمووی : بــه ڕاستی من کرده‌وه‌ی هیچ خاوه‌ن کــارێ لــه ئێوه بــه فیڕۆ نــاده‌م ، نێر بێ یــا مێ ، که هه‌ندێــکتان لــه هه‌ندێکتان نــه ٠

لێره دا دیسان دادگه‌ری‌و یه‌کسانی ڕژێمی خوایی به شێوه‌یێکی په‌روه‌رانــه ده‌رده‌کــه‌وێ کــه‌وا هــه‌ر پیاوو ئافره‌تێــك ، هــه‌ر کــارو فرمانێــکی باش بکه‌ن خواوه‌ندی گه‌وره پاداشتیان وه‌ك یه‌کتری ده‌داته‌وه، بۆ نموونه : ئــه‌گه‌ر پیاوێك پێنج دینــار بــه هــه‌ژران ببه‌خشــێ ، وه ئافره‌تێــکیش وه‌ك پیاوه‌که پێنج‌دینار بــه هــه‌ژاران ببه‌خشــێ ، لێــره‌دا پاداشتی هه‌ر دووکیان له لایان یه‌زدانه‌وه یه‌کسانه ٠

دیسان ده‌رباره‌ی دادگه‌ری‌و یه‌کسانی نێوان پیاوو ئافره‌ت‌و گشت موسڵمانان خواوه‌ندی گه‌وره ده‌فــه‌رمووی :

« یا أَیُّها النَّاسُ انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوباً وقبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم » ، ( الحجرات ـ الآیة : ١٣ ) ٠

واتــه : ئه‌ی خه‌ڵــکینه ، ئێمه ئێوه‌مان لــه نێرومێ یه‌ك دروســت کردووه ، وه کردومانن به چه‌ند گه‌ل‌و هۆزێکه‌وه ، بۆ ئــه‌وه‌ی یه‌کتری بناسن ، باشترینتان لای خواوه‌ند ، ئــه‌و که‌سه‌یه کــه زیاتــر ســوپاس‌و ستایشی خوا بکاو پتر مل که‌چی فه‌رمانه‌کانی خوا بێ ٠

دوو باره لێره‌دا دیسان ، ئه‌مه به‌ڵــگه‌یه‌کی تری یاســاو ڕژیمێ خوایه ، ده‌رباره‌ی یه‌کسانی نێوان پیاوو ئــافره‌ت لــه تای تــه‌رازووی دادپه‌روه‌ری خواوه‌ندا ٠

جا بـا ناحەزانی ئیسلام با هەر قوڕ بپێون‌و لەسەره خۆیـان بدەن‌و پڕو پاگەندەی بەدرۆ لـە دژی ڕژێمی پیرۆزی ئیسلام بلاو بکەنـەوە ، دەربارەی جیاوازی کردنی ئیسلام لـە نێوان پیاوو ئـافرەت دا • جا بـەم ڕەفتـاره نـاشیرین‌و ناڕەوایە ، هیچ بـە هیچ ناکەن ، جگە لە ڕیسوایی‌و سەرگەردانی‌و سەر لێ‌شێواوی نەبێ •

★ ★ ★

# مافی خاوەنداریێتی بۆ ئافرەتو پیاو لە ڕژێمی ئیسلام دا پارێزاوە

بە ڕاستی ڕژێمی ئیسلام ، ڕژێمێکی زۆر بێ هاوتایە ، هەموو باروـ ۆخێکی ژیانی کۆمەڵایەتی ئادەمیزادی لەسەر ئەم زەویەدا گرتۆتە باوەشی‌یەوە ، چ لە بواری کارکردنو پەرەپێدانو خەرج کردندا ، وە یا لە ئاڵوگۆڕو کڕینو فرۆشتنو ڕەهنو بەکرێدانو میراتدا ، هەر وەکو خواوەند دەفەرمووی :

« للرجال نصيب مما ترك الوالدان والاقربون وللنساء نصيب مما ترك الوالدان والاقربون » ، ( سورة النساء ـ الآية : ٧ ) •

واتە : لە بۆ ئادەمیزادی نێرینە بەشێ هەیە ، لەوەی باوکو دایکو خزمان بە جێیان هێشتووە بۆیان ، هەروەها بۆ مێینەش بەشێ هەیە ، لەو میراتەی کە باوکو دایکو خزمانی نزیکیان بە جێیان هێشتوە بۆیان •

وە دیسان دەربارەی خاوەنداریێتی لە ئایەتێکی ترا خواوەندی گەورە دەفەرمووی :

« للرجال نصيب مما اكتسبوا وللنساء نصيب مما اكتسبن » ، ( سورة النساء ـ الآية : ٣٢ ) •

واتە : پیاوەکان بەشیان هەیە ، لەوەی دەسیان ئەکەوێ و پەیدای ئەکەن ، لە بەشی ئایینیو دنیاییدا ، وە لە بۆ ئافرەتانیش بەشیان

هەیە ، بەشێ لەوەی کە دەمیان ئەکەوێ لە بەشی ئاینیی یا دنیایی ، وە ئەم بەشانە ئەوەی بەخشینە لە لایەنی خوداوە ، ئەوە پەیوەندی نی یە بەکۆشش و کارو ئیشەوە ، وە ئەوەیشی پەیوەندی هەیە بە کارو کۆششەوە ، جیاوازی پیاوو ئافرەتی تیایا نی یەو بەشی بەفیڕۆ ناچێ •

لێرەدا پێویستە هەڵوێستێکی کەم بکەین ، سەبارەت بە مافی خاوەندارێتی لە ڕژێمی ئیسلام دا ، وەشێوەو ڕێبازی بە کارهێنان و سوود لێوەرگرتنی وە بەراوردیشی لە گەڵ ڕژێمی سەرمایەدارێتی و ئیشتراکی دابکەین ، تا بزانین ئەو دوو ڕژێمە هەڵوێستیان چۆن بووەو چۆنە ، دەربارەی خاوەندارێتی ئافرەت •

لێرەدا ئەگەر سەیرێکی ڕژێم و دەستوورەکانی ڕابوردووی ئاوروپا بکەین ، دەربارەی باری کۆمەڵایەتی ئافرەت ، باش بۆمان ئاشکرا دەبێ کەوا ئافرەتی ئاوروپا تا ماوەیێکی کەم لەمەو پێش دا ، لە هەموو مافێکی خاوەندارێتی بێ بەش بوو ، وە هەتا ئەوەی لەمەودواش کە بەدەستی هێنا ، زۆر بە سووك و ئاسانی وە دەستی نەهێنا ، بەڵکو لەپاش خەبات و کۆشش و هەوڵ و تەقەلایێکی بێ ووچان و ئارەق و فرمێسك و خوێن ڕشتنێکی فرە زۆر ، ئینجا کەمێك لەو مافانەی کە ڕژێمی ئیسلام دابووی بە ئافرەتی موسڵمان دەربارەی خاوەندارێتی وەری گرت ، واتە ئافرەتی ئاوروپا ماوەی دوانزە سەدە پاش دامەزراندنی ڕژێمی ئیسلام ، بێ بەش بوو لە زۆر ترینی ئەو مافانەی کە ئیسلام بە ئافرەتی دابوو •

دیسان ئەگەر سەیری ڕژێمی ئیشتراکی شوعیەت بەتایبەتی و وە

ڕژێمی سەرمایەداریتی بەگشتی بکەین ، دەبینین کە کیانی مرۆڤـایەتیان بەستاوە بـە قـەوارەی ئـابووری ، وە بە ئاشـکراو بـەبێ هیچ پێچو پەنهـا دەڵێن ، ئافرەت هیچ کیانێـکی نی یە ، چونـکە خاوەنی سـامانو دارایی نی یە ، وە یـا هیچ مافێکی نی یە دەربارەی ئەو سامانو دارایی یەی هەیەتی ، کـە بتوانێ بـە هەوەسو ئـارەزووەمەندی خۆی دەسکاری یان لێبکا • هەر چەندە ئایینی ئیسلام دژی ئـەم جـۆرە خاوەنداریتی یـە ، چونـکە لـە مەودایێـکی یەکجار فرەتەسك دا پێی داوە • وە هـەر چەندە لـە لایێـکی تریشەوە ، ڕوانـگەی ئیسـلام لـەگەڵ ئـەو بیرو باوەڕە دایە کە کیانی ئـابووری کارکەرێکی یاریدەدەری فرە کارێگەرە بۆ هاندانو پێك هێنانی هەستو نەستی ئـادەمیزادو پەرە پێدانی هەست بـە خۆکردنی •

**( سـەربەرستی ئافـرەت لە ئیسـلام دا دەربارەی شووکردنو دەربڕینی بیرو ڕای ) •**

لێرەشدا دیسان ئیسلام ، هەر لەسەر هێنـانەدی کیانی ئـافـرەت دەربـارەی کێشـەی خاوەنداریتی نـەوەستا ، بەڵکو زۆر لەمەگرنگتری بۆ بـەدی هێناوە کە ئـەویش ئـەو کێشانەیە کە ڕاستەو خۆ پەیوەندی یان بەژیانیـەوە هەیە ، کە ئـەویش کێشەی سەربەستی ڕاوەرگرتنی ئافرەتە لـە کاتی بەشوودانی ، کەوا نابێ مارەیی ئـافرەت ببڕێ تـا ئیزنی لـێ وەرنەگیرێ ، وەمارە بڕینـەکەشی تـەواو نابێو دانـامەزرێ تـا خۆی ئیزن نـەدا کەمارەی بکەن ، لەسەر فەرموودەی پێشـەوای ئیسـلام کـەفـەرمـوویـەتی :

**( لا تزوج الثیب حتی تستأمر ولا تزوج البکر حتی تستأذن واذنها صماتها ) •**

واتـه : ماره برینی‌بێوه ژن دانامەزرێ تـا فـەرمانی پێ نەکرێ . وه مارەیی کچیش دانامەزرێ تا ئیزنی لێ وەرنەگیرێ، وه بێدەنگیەکەشی بـه ئیزن دا دەندرێ •

بەلام ، زۆر بـه داخەوه که ئـەو مافـه پیرۆزه ، هەر خەیالی‌یـەو بـەس ، لـه باری ئـابووری‌و کۆمەلایـەتی ئێسـتا ، وه لـەباری ئـەو نـەریتی ئـەوتۆ کەتیا دەژین ، بەلام ، هەرگیز ئیسلام ، لـێ پرسراوو تاوانبارنی‌یه ، لەو هەموو سەرپێچی کردنانەی که له ڕژێمەکەی دەکەن ، وەیـا یاساکانی جێبەجێ ناکەن • بەڕاستی ئافرەتی موسلمان ، هـەر لـەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا ئـەومافەیان وەرگرت ، لـه سـەر بریـاری پێشـەواو دامەزرێنـەری ئیسلام ، وه هەروەها جێنشینه کانیشی له پاش وی دا پەیرەویان کرد ••• وه ئێمەش ئیستا داوا لەلێپرسراوان‌و زانایانی ئیسلام دەکەین که پەیرەوی جێ بەجێ‌کـردنی بکەن • چونـکه پایـه بـەرزی‌و پیاوەتی لەوه دایه که مرۆڤی موسلمان‌و خاوەن بروا لـەسـەر سوننەتی پێغەمبەر (د•خ) ڕەفتـار بکا ، وه خۆی نـه بەستێتەوه بـه داب‌و عورف‌و عادەتی پڕو پووچی ناوکۆمەلەوه ، کـه هیچ پـەیوەندی‌یان نـه بەنزیك‌و نـه بـه دوورەوه بـه ئیسلامەوه نی‌یه • هەر چەنده ڕێبـازی ئیمامی شافیعی خوای لێ ڕازی بێ وایه ، ئـەگەر باوك‌و باپیره دادپەروەر بن ، مافی ناچارکردنی کچیان هەیه کە شوو بکا به کەسێکی تایبەتی ، چونـکه خۆشەویستی‌و دلسۆزی‌و دادپەروەری‌یەکەیان هەرگیز ماوەی ئـەوه ناهێلێتەوه که مێردی ناشایسته بۆ کچەکە بدۆزنـەوه ، وەبەپێی بـەرژەوەندی ئـەو کچه ئـەیدەن بەشوو • جا هەرزەگۆیەکان ئەمەیان کردووتـه بنیشـته شـینکەو هەمیشه ئـەیجوونـەوه ، گوایـا ئیسـلام ڕژێمێکی دواکەوتووەو سەربەستی شووکردنی نـەداوتـه دەست ئافرەت،

هەتـا بـە هەوەس‌و ئـارەزووی خۆی شووبکا ، وە هەتـا ماوەشی‌داوە بـە بەخێوکەر کە کچی نـاوبێشـکەش مارەبکەن .. هتد .

بەڵێ ، کەزانایانی ئیسلام ئـەم مافەیان داوتـە بەخێوکەری ئـافرەت کـە دەتوانی بەشوویان بدا ، لەسەر ئـەو دامەزراوە کە ئـەو بەخێوکەرە چ بـاوك یاباپیرەبێ ، چونکە ئـەوانـە هەمیشە لایەنگیری بەرژەوەندی دوا ڕۆژو چارەنووسی کچەکانیان دەکەن ، بۆیی زانایانی ئیسلام لەچەند حاڵەتێـك دا مافی ئـەوەیان داوتـە دەستیان ، ئەگینا ئەگەر بەخێوکەرێك گومانی نادادپەروەری لێ‌بکرێ کـە بـە پێچەوانەی بەرژەوەندی ئـەو کچە ڕەفتـار دەکا ، ئـەو کاتـە ئـەو مارە بڕینە هەڵـدەوەشێنەوە ، وە دانـامەزرێ لـە سەر فەرموودەی گەورە زانایانی ئیسلام . بێ‌گومـان ئـەو مافـەی کە ئیسلام داویتی بـە ئافرەت هەرگیز ئـافرەتی ناموسڵمان لـە هیچ سات‌و سەردەمێـکا وەری نەگرتووە ، هـەتـاکو لـە هـەندێ حالات‌دا مافی ئەوەشی دراوتێ کە خۆی بتوانێ بەبێ باوك یا باپیرە یاهەر بەخێوکەرێـکی تر مارە بکا ، ئـەگەر هاتوو بێوە ژن بوو وە یا کچ‌بوو ، بەلام بەخێوکەرەکەی نەیدەویست بیدا بەو کەسـەی کە کچە دەیـەوێ شـووی پێ بکا ، ئـەو کاتە کچە دەتوانێ بچێتـە لای قـازی‌و خـۆی مـارە بکا ، لەو کەسەی کە خۆی دەیەوێ مێردی پێ بکا بەبێ ڕەزامەندی بەخێوکەرەکەشی ، چونـکە بەرژەوەندی‌و ئـارەزوومـەندی کچەکـە لـەوەدایـە کە شوو بـەو کوڕە بکا .

وە ئـەو مافەش کە ئێستا وولاتە سەرمایەدارو پێشکەوتو خوازەکانی سـەدەی بیستەم لێی‌بێداربوونەتەوەو وە ماوەیێـکی کەمە کـە داویتیان بـە ئـافرەتـەکانیان ، وە هەمیشە شانازی پێوە دەکەن‌و لەلایان وایە کـە مافێکی تـازەیە کـە دراوە بـە ئـافرەت ، وە هەرگیز ئـافرەت شـتیی

وای بەخۆیەوە نەدیتوەو مافی ئـەوەهای بە درێژایی ڕەوڕەوەی مێژووی ئـادەمیزاد نـەدراوتێ ، کە بەسەر نـەریتی و داب‌و عادەتی کۆن دا زال بوینـە ، بەڵام ، ئەوەیان لـە یاد چووە کە ئیسلام هەر لـە سـەرەتـای بانـگەوازەکەیا ، وە هەو لـە سەردەمی پێشـەوا مەزنـەکەیـا ، هـەموو تەنـگوچەڵەمەیەکی دەربارەی چارەسەرکردنی ئـەم کێشەیە بڕاوتەوە، چونـکە ڕژێمێکی سەربەخۆو خواییە ، وە هەمیشـە تێ دەکۆشـی بۆ بـەرژەوەنـدیو کامەرانیو شادیو ئـازادیو بـەختـەوەری ژیانـی مرۆڤـایەتی ، وە بۆ سەر ئادەمیزاد هاتۆتـەخوارەوە ، بـە شـێوەیەکی ئەوتۆ کە بتوانێ بگونجێ لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایـەتی مرۆڤ دا بە پێی سـات‌و شـوێن‌و گـەشـەکردنی ژیانی ئـادەمیزاد لـە هەموو چاخ‌و گۆشەیەکی جیهانـدا •

★ ★ ★

# یەکسانی ئافرەت لە بواری فێربوونی زانستو زانیاریی لە ژێر سایەی ڕژێمی ئیسلام دا

بەڕاستی شکۆیی‌و گـەورەیی‌و پایـە بـەرزیی ئیسـلام ، لێـرەدا دەردەکەوێ ، کە ئەگەر مرۆڤ ئاوڕێك لەڕابوردووی ئیسـلام بداتەوە ، کەوا تا چ ڕادەیەك ڕێزی لـەکیانی مرۆڤایەتی گرتووە ، بەتایبەتی لـەو سـەردەمانەدا کە شەوەزەنـگی نـەزانین‌و نەفامی شاباڵی سەرانسـەر بەسەر جیهاندا هێنابوو ، کەواچۆن زانست و زانیای و خوێندنی کردبووە دروشمی خۆی ، وە لە سەر هەموو موسڵمانێکی نێرومێی بەبێ جیاوازی پێویست کردبوو کەدەبوا هەموو کەسێك فێـری ببێ ، بـەبێ ئـەوەی کـە تـاکە ڕژێمێك بووە لـە مێژووی ئـادەمیزاد دا ، کەسەیری ئافرەتی لـە بنچینـە کانی بڕواهێنـان بەخوا لـە سەرپبازی ئیسلامدا •

وەلێرەدا ئـەبێ مرۆڤی موسڵمان و خاوەن باوەڕی و ئیمان ، زۆر شـانـازی بەپایە بەرزی‌و شکۆیی ڕژێمی‌ئایینی ئیسلامی‌پیرۆزەوە بکا ، کـە تـاکە ڕژێمێك بووە لە مێژووی ئـادەمیزاد دا ، کەسەیری ئافرەتی کردووە وەك ئـادەمێتی کەوا هیچ جیاوازی یەکی نەکردووە لـەگـەڵ پیـاو ، وە هەر وەکوو پیاو مافی خوێندن‌و فێربوونـی داوەتێ ، وە لـە سـەریشی پێویست و فەرزکردووە کە دەبێ فێری خوێندن‌و نووسین‌و زانست بێ هـەروەکوو پێشـەوای مـەزنی ئیسـلام فـەرموویـەتی :

**( العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة ) •**

واتـە : زانست پێویستە لـە سەر موسـڵمانی پیـاوو موسـڵمانی ئـافـرەت •

وەهەروەها ئیسلام فەرمانی بەفـەرمان ڕەوایانو لـێ پرسـراوانی ڕژێمەکەی کردوە کەوا دەبێ گرنگی بە ئافرەت بدرێ هەتا لـە بواری ڕۆشنبیر یشدا تـا گەشە بەبیرو بیرکردنەوەو ئەقڵی بدرێ ، هـەر وەکوو گرنگی بەجەستەوگیانی دەدرێ هەتـاکو جیاوازی ببێ لەگـەڵ ئاستو ڕێزی ئـاژەڵی وە لەسـەردەمێکدا ئیسـلام ڕێـزی ئـافرەتی ئـەوها دەگرتو گەشەی بـە ئـەقـڵو جـە ستەو گیانی دەدا ، وەمافی فێربوونو سەربەستی باوەڕو دەربڕینی بیروڕای دەداێی ، کە هەرگیز وولاتە ئـاوروپی‌یەکان هەتـا ئـەو نزیکانە ، هەردانیشیان بەو مافـانەدا نـەئـەنـا ، وەسەیری ئـافرەتیشاین وەك ئـادەمیزادنە دەکرد •

جاتـا ئـەوڕادەیە ئیسلام ڕێزی ئـافرەتی گرتووە ، کەهیچ کەسێکی خـاوەن بیروهۆشو ویژدانهـەرگیز ناتوانـی دانـی‌پیانـەنێ‌وبڵێ ، ئـەوبۆچوونو بیرکەو بیروباوەڕی یەی ئیسلام ، دەربارەی ئەمهەموو شاکارانەی سەبارەت بە ڕێزگرتنی ، کەواسەیری ئافرەتی بـە چاوێکی سووك کردووە وە یا هیچ دەورێکی مێژوویی لـە بارودۆخی کۆمەڵایەتی داپێ نـەداوە • خۆ ئـەگەر وانـە بوابە ، گرنگی هەرگیز بە فێربوونی نـە ئـەدا ، چونـکە کێشـەی خوێندنو فێربوونی مانایەکی یەکجار زۆر دەبەخشێ لـە تەرازووی ئەقڵو مەنتیق دا • خۆ بەس تەنها گرنـگی دان بـە خوێندن و فێربوونی تـەواو بەسە بۆ ئەومەبەسـتەو ، ئیتر پێویست بـە هیچ بەڵـگەیەکی تر ناکا ، کەوا ئافرەت لـە ژێر سـایەی ڕژێمی ئیسلام دا هەموو مافێکی تەواوی بە پێی سروشت و پێکهاتنی جەستەکەی وەرگرتووە •

بەڵام ، هەرچەندە ئیسلام ، یەکسانێکی تەواوی لەبواری مرۆڤایەتی دا لـە هەموو مافێـکی کە پەیوەندی بە گیانو بوونی مرۆڤ پـەروەری

هاوبەشی هەبێ لە نێوان هەموو کەسێکەوە کردووە لە چەند ماف‌و فرمانێکیشدا بە شێوەیەکی ئاشکرا ، جیاوازی لە نێوان پیاوو ئافرەت لە بەر چەند پەندیاریی و هۆیێکی تایبەتی‌دا کردووە ، کە مرۆڤی هۆشمەندو ڕۆشنبیر ، هەرگیز بە جیاوازی‌یان دانانێ ، ئەگەر لە هۆی ئەو جیاوازی‌یانە بەڕێبازێکی زانستیانە لێ‌یان بکۆڵێتەوە ، چونکە لە ڕاستیشدا جیاوازی نینە •

جا لێرەدا مشت‌و مڕێکی یەکجار زۆر هەیە ، لە نێوان چەند کەسانێکدا کە بەتەواوی لە بنەڕەتی کێشەکە تێ نەگەیشتونەو وە ئەوانەش کە لە بنەڕەتی مەسەلەکەیێ گەیشتونە ، کە ئەوەش چەند کەسانێك دروستی دەکەن وە یا •• ، وە چەند نووسەرو گەنجێکی کە بە ڕەگ وڕیشەی مەسەلەکەدا شۆڕنەبوونەوەو بەسەر پێوە سەیری ئەکەن ، وەفرمێسکی بەدرۆ بۆ ئافرەتان هەڵدە ڕێژن ، گوایا ئیسلام لە زۆر شت جیاوازی ئافرەتی لەگەڵ پیاو کردووە ، ئا ئەوە جیاوازی نینە لە نێوان پیاوو ئافرەت کە ڕژێمی ئیسلام کردوویەتی لە میرات‌و •• و•• و •• و •• بەڕاستی ئەو جۆرە کەسانە ، هەرخوا بۆخۆی دەزانی کە نیازی‌یان چی‌یە ، وە داواکاری یەکەیان لەبەر چ مەبەستێکی خراپ‌و ناڕەوایە ، تەنها مەبەستیان ئەوەیە کە ئافرەت سووك‌و ڕیسوا بکەن لە نێوان کۆمەڵدا • وەلە لایێکی تریشەوەش دەیانەوێ ئافرەتی موسڵمان لە سەر بیرو باوەڕەکەیان سارد بکەنەوە •

وەلێرە شدا پێش ئەوەی درێژە بەباس کردنی ، ئەو خاڵانەی بدەین کە گوایا کە ئیسلام تیاندا جیاوازی لە نێوان پیاوو ئافرەتاکردووە پێویستە کێشە کە بگێڕینەوە بۆ سەر پوختەی بنەڕەتی ڕاستی خۆی ،

نـابـی لایەنەکانی زانستی ئەندامو بیولۆجیو سـیکلۆجی فـەراموش کرین ، ئەمجا بیرو ڕای ئیسلامی تێـدا دەربڕینو بەشێوەیێکی زانستیانە لێی بکۆڵینەوە ، وە لە هەمان کاتیش دا ، پێویسـتە ئـەم پرسـیارانەی خوارەوەش ئـاراستەی ئـەو سـەر لێ شێواوو گومڕایانـە بکەین کـە بـە نـاڕەوا بیانوو ڕەخنە دەربارەی یەکسانی پیاوو ئـافرەت لـە ڕژێمی پیرۆزی ئیسلام دەگرن :

ئـایـا پیاوو ئـافرەت لـە یەك ڕەگەز (جنس) پێـکهاتوونە ، یـا خود لـە دوو ڕەگەزی جیاوازی پێـکهاتوونە ؟ وە ئایا فرمانو پێکهاتنی جەستەن هەر دووکیان ، لەهەموو لایەنێکەوە وەك یەك وانە ، یـا خـود جیـاوازن ؟

جـا لێرە دا مەسەلەکە گەورەتر دەبێو گفتو گۆیەکەمان دەسـت پێ دەکا ؟ ئـەگەر ڕەخنەگرەکان ووتیان : هیچ جیاوازیی یەك لە نێوان پیاوو ئـافرەت چ لە پێکهاتنی جەستەیی ، وە لە کیانی ویژدانی ، وە لـە فرمانی ئـەندامەکانی لەشیان دا نییە ، ئەو کاتە ، ئێمەش هیچ قسەیەکمان لەگەڵیانـا نییە ، چونـکە دیارە هەر لەسەرەتاوەدان بەڕاسـتیدا نانێنو هـەر دەیانـەوێ بـەزۆرەملێ بەرگـری لـە قسـە پڕوپووچـەکانیـان بکـەن ؟ بەڵام خۆ ئـەگەر دانیان بەو جیاوازیو ڕاسـتیانەش داهێنـا ، ئـەوکاتـە دەتوانین بەشێوەیەکی زانسنیانە گفتو گۆیان لەگـەڵ بکەینو پێیان بڵێن : کەواتـە هەر لـە بەر ئـەو جیاوازییانەیە ، خووسروشتی پیاوو ئـافرەت وەك یەك نینە ، وە هەر ئـەو خووجیاوازییە سروشتیانەش وای لێ کردوونـە ، کە هەریەکێکیان خواستو ویستێکی تایبەتی خۆی لێیاندا هەبێ کە لـە زۆر ڕووەوە لە گەڵ ئـەوی تردا جیـاواز بێ •

بەڵێ ، پیاوو ئـافرەت لـە بواری مرۆڤـایەتیو ئـادەمییدا هیـچ

جیاوازی یەکیان لـە نێوان دا نی‌یە ، هەردووکیان یەك نەفسن ، بـەڵام ، چۆن دەتواندرێ یەکسانی لەفرمانو ئیش‌و کارەکانی ژیانو ڕێبازەکانی‌دا جێ بەجێ بکرێ ، خۆ ئەگەر هەموو ئەوکەسانەی بیانوو ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن ، کۆبنەوە ، وە دەربارەی مەسەلەی ئافرەت کۆنگرەی بۆ بگرنو وەبڕیاری بۆ دەرکەن •

ئـایـا لـە توانای کۆنگرەو بڕیارەکانیانـدا هەیە هیچ شتێك لـە سروشت‌و خۆوی ئـەوان بگۆڕێ ؟ وە پیاووا لێ بکاکە هاوبەشی ڕاستەو خۆ لـە گەڵ ئافرەتـا بـکا لـە زاوزێ کـردنو شـیر بـە منـداڵ دانو پـەروەردەکردنیدا ؟

وە ئایا هەرگیز دەتوانن ، هەست‌و نەستی بـە زەیی‌و دڵسـۆزی‌و خۆشەویستی‌و پەروەردەکـردنی منـداڵ کە تایبـەتی‌یە بـە دایك بـی وڕن بۆ پیاو ؟ وە ئـایـا هیچ پیاوێـکیش دەتوانی ئـەو بەزەیی‌و ئـارام گرتنـەی کەدایك هەیەتی بەرامبەر منداڵەکەی ئـەو بیبێ ؟ وە ئایا لـــە توانـاو وزەی هیچ پیاوێك دا هەیە ، وەك دایکێـك منداڵێـك پەروەردەو بەخێو دەکا ، باوکێـك بیکات ؟ وە ئایا جەستەی هیچ پیاوێك وەك لەشی ئـافـرەتێـك وایە ، کە بتوانێ زاوزێ بکاو ، بـە هۆی مەمکەکانی شیر بە منداڵ بدا ؟ وە ئایا هەست‌و نەست‌و بەزەیی‌و خۆشەویستی‌و دڵسۆزی، هیچ پیاوێك وەك دایکێـك وایە بەرامبەر بـە منداڵـەکەی ؟

ئـەو هەموو خوو ڕەوشتانە شتێکی سروشتینە ، خواوەندی گەورە بەخشیویتی بـە ئافرەت ، لـە هەست‌و نەستی ئـافرەت دانە بە شێوەیێکی ئەوتۆکەهەرگیز هیچ ئادەمیزادێك ناتوانێ بیان گۆڕێ •

بـەڵام ، پیاویش لـە لایـکی ترەوە چـەند فرمانێـکی گرنـگ‌و گرانتری خراوەتـە ئەستۆ ، کەواتـە چۆن پیاو ناتوانێ لەگەڵ ئافرەتا لە

چەند ڕووێـکەوە هاوبەشی بکا ، هەر شێوەیەش ئافرەتیش لـە مانـەدا
ناوانێ هاوبەشی لـە گەڵ پیاو بکا چونکە هەر یەکەیان بۆ چـەند ئیش و
فرمانێکی ژیانی تایبەتی ئامادە کراون ، وەك پیـاو ئـامـادە کـراوەو لـێ
پڕسراوە بۆ زۆران بازنی و بەربەرەکانی لەگەڵ ناهـەمواری و کـەنـدو
کۆسپی ژیـان لـە دەرەوەدا ، چی ئـەو شەڕە ملەو زۆران بـازی یـە ،
لەگەڵ درندەدا بووبێ لـە دارستانەکاندا لـە چاخەکانی دێرین دا ، یـا
لـە گەڵ هەر هێزێـکی تری سروشتی چ ئاسمانی بێ یاخود لـە زەویی
یابێ ، یـا بەرامبەر ڕژێمێـکی میری و یـا یاسایێـکی ئابووری دابێ ...
ئـەوانـە گشتیان بۆ وەدەست هێنانی بژیوی ژیان و پاراستنی خـۆی و
خێزان و منداڵەکانێتی ، لە دەست درێژی کردن و پەلاماردان و بەسەرادانی
دوژمنانێتی • بەڵام ، ئـەم قسانەمان وانـا ئەیـەنن ، کـەوا جیاوازێـکی
یەکجار زۆری ئـەوتۆ لە نێوان ئـەم دوو ڕەگەزەدا هەیە ، کەمانای وابێ
هـەر یەکێکیان بـە هیچ جۆرێـك نەتوانێ ئیش و کاری ئەویتریان بکات •
خۆ ئەگەر هاتو ئافرەتێکت بینی کە توانایی فەرماندەیی یا سوپاسالاریی
یـا هەڵـگرتنی ئـاسن یـا زۆرەبانـێ یـا لەشەڕوکوشتار یـا لـەهـەر
ئیش و فرمانێـکی ترا دەستێکی باڵای هەبێ ... وەیـا لەهەمان کاتیش دا
خۆ ئـەگـەر پیاوێـکشت بینی ، کەوا شارەزایێکی فرە زۆری لە چێشت
لێنـان و هەڵسورانی ئیش و کاری ناومـاڵ ، یا سـەرپـەرشـتی کـردن و
پـەروەردە کردن و بەخێوکردنی منـاڵ وە یاوەك دایکێـك لـە هـەموو
هـەستونەستی منداڵەکەی بکات و سۆزی بەرامبەر منداڵەکەی هـەبێ •
ئـەمـانـە گشتیان فرمانێـکی سروشتینەو ئـەنجامێـکی ڕاستن ، کـەوا
دەبێ و ڕێك دەکەوێ لـە نێوان هەزاران ئـافـرەتانیش دا ئافرەتێـك
هەڵـدەکەوێ کـە زۆر بلیمەت و ئـازاو چالاك و پاڵەوان دەبێ ، کە زۆر

بـه دەگمەن پیاوی ئـەوەها هەڵدەکەوێ ، کە کاروباری وولاتێك یائینن و کاری فـەرمانـگایەك بەڕێوە دەبات ، یا سەربەرشتی پرۆژەیەك دەکات ،

بـەلام ، هەڵـکەوتنی ئـەم جۆرە پیاوو ئـافرەتـانە ، لـە بواری نـا ئـاسایی خوو ڕەوشتی سروشتی خۆیان دا شتێکی نـاوازەن ، وە هەرگیز ناوازەیش نـا بێتـە بنواشەو یاساو دەستوور لـە هـەر شتێکا ، چونـکە لـە هەر دەستوورو بنواشەیێك دا نـائـاسایێك هەر ڕوودەدا • بۆ سوونە هـەر یاساو بنواشەیێك بگرە چ لـە ڕێزمانی هەر زمانێـکاوە یـا لـە هەر شـتێکی ترا ، دەبینی بـە سەدەها ناوێزەی تێـدا بەدی دەکرێ ، ئەمانە وا نـاگەیەنن کەوا بنواشەو یاسایەکە هەڵدەوەشێنەوە ، بە هۆی پەیدا بوونـی ئـەو نـاوێزەیـە •

هە تاکوو ئێستا ڕاستی جیاوازی بەکانی نێوان پیاوو ئـافرەتمان باس کرد ، وە ئێستاش دەگەڕێنەوە سەر ئـەو خاڵو شوێنە گرنـگانەی کـە ئیسلام جیاوازی‌یان لـە نێوان دەکات • بە ڕاستی پایە بەرزی‌و شکۆیی‌و گـەورەیی ، ڕژێمی ئیسلامی پیرۆز لـە وە دایە کە ڕژێمێکی واقعیـــە کـە هەمیشـە چـاو دێـری‌و ئـاگـاداری ئـەو تـەبیعـەت‌و خـــوو ئـارەزوونـەی کـە ئـادەمیزاد لـە سروشتیەوە هـەیەتی دەکات • وە هـەمیشـە دەیـەوێ شـان بە شـانی ئـەو تەبیعەت و خوو ئـارەزوو سروشتیانەی کە ئـادەمیزاد لـە سروشتیەوە هەیەتی بڕوا ، وە یەکـسانی لـە نێـوان پیاوو ئافرەت لەو شوێنانە دا بکات کە دەگونجێ لـە گـەڵ سروشتی ڕاستی دروست بوونیان ، وە جیاوازیشیان لەو شوێنانـەدا بکات کـە لەگەڵ مەنتیقی سروشتی ڕاستەقینەی دروست بوونیان بگـونجێ • جـا لێرە دا بـا بگـەڕێنـەوە سەر ئـەو خاڵو شوێنانەی کە جیاوازی‌یان لـە نێوان کراوە ، وە بەشی‌کردنەوەو لێ کۆڵینەوە یەکی زانستیانـە

شـيتەڵيان بكه ينەوە ، تـا بزانين ئيسلام لـە بەر چ هۆو هودەيەك ئـەو جياوازيانەی لـە نێـوان ئـەو دوو ڕەگەزە دا كردوو :

( ١ )

بۆ چیو وە لەبەر چ هۆيەك ڕژێمی ئيسلام مافی پياوی لـە ميـرات گرتـا ، دوو ئـەوەندەی مافی ئـافرەت داناوە ؟ پێش ئـەوەی وەڵامـی ئـەم پرسيارەی سەرەوە بدەينەوە ، پێويستە چەند ڕاستیيەك هـەيـە ، پێشەكی بيان زانين و بيان خەينە ڕوو . ئينجا وەڵامی پرسيارەكە بدەينەوە، بۆ ئـەوەی بەباشی لـە ڕاستی مەسەلەكە تێ بگەين :

١ ـ ڕاستە ئيسلام دەربارەی مەسەلەی دابەش كردنی ميرات لـە نێـوان پياوو ئـافرەتـا دەڵـێ :

**( للذكر مثل حظ الانثيين ) .**

واتـە : ( نێرينە لـە ميراتـا بۆی هەيە ، دوو ئەوەندەی بـەشـی مينـە وەرگرێ ) .

٢ ـ لێرە دا ئـەگەر كەمێـك بير بكەينـەوەو سـەرنج بدەينـە ، فەلسـەفـەی ئـەم فـەرموودەيەی خواوەند ، كە بەشـی پيـاوی دوو ئـەوەندەی بەشی ئـافرەت دانـاوە ، ئـەبێ هۆو هودەو مەبەستێك لـەو جياوازیيەی نێوان ئـەو دوو ڕەگەزەدا هەبێ ، چونـكە هەميشـــە خواوەند لـە هەموو كەس بۆ هەردوو ڕەگەز بە پەرۆشتروداد پەروەرترو دادگەرترە ، وە هەرگيز نايەوێ زەڕەيەك ستەم بەرامبەر هەر يەكێـكيان بكرێ ، وە يـا تای تەرازوو لاسەنـگ بێ بـەلای يەكێـك لـەم دوو ڕەگەزەدا ، وە ئەگەر شتێـكی وا ڕوویدا ، ديـارە مـەبەستێك لـەم

جیاوازی‌یەی ، ئێمە بە جیاوازی لـە قەڵـەم دەدەین‌و دەزانین هەیە ، کـە ئێمـە هەستی پێ ناکەین و نایزانین ، وە یـا خۆمانی لێ کەودەن‌و گێل‌و نەفام دەکەین ، ئەگینا ئـەوە لـە ڕاستی‌دا جیاوازی نی‌یە ، بەڵکوو دادپەروەری خوایی‌یەکە نایەوێ هیچ یەکێـکیان لـە مافی ڕاسەقینـەی خۆیان بێ بەش‌و بەش خوراو بێ ، وە هەر یەکێکیان بەپێی پێداویستی بژێوی ڕۆژانەی خۆی مافی خۆی وەرگرێ ، لەو مافانەی خواپێی داوە لـە میراتـا •

جا لێرەدا ئـەگەر بیر لـە فەلسەفەی ئـایەتی میرات بکەینـەوە ، ئـەم ڕاستیانەی خوارەوەمان بۆ دەر ئەکەوێ :

أ ـ بێ گومان پیاو لـە هەموو چاخ‌و ساتێکا بـە پلـەی یەکەم لـێ پرسراوو موکەڵەفە ، بۆ هەڵسوڕاندنی بەڕێوە بردنی خاوو خێزان‌و ئـەو کەسانەی کە ئـەو لێ پرسراویانە ، وە لـە سەریەتی کە ئـەو پـارەو پوولەی هەیەتی لێیان خەرج بکاو بە باشی بیان ژێنی •

ب ـ گەلێ جار ئـافرەت موکەڵەف‌و لێ پرسراو نی‌یە ، بۆ خەرج کردنی هیچ لەو پارەو پوولانەی کە هەیەتی بۆ هەڵسوڕاندنی بـەڕێـوە بردن‌و ئیدارەی خاوو خێزان ، بەس بۆنەفسی خۆی نەبێ • هەر چەندە بـە دەگمەن وا ڕێك دەکەوی ، کە ئـافرەتێك سەرپەرشتی خاوو خێزانێك بـکاو ، وە لەو پارەو پوولەی هەیەتی بۆیان خەرج بکات ، لـە پێنـاوی بژێوی ماڵ‌و مناڵەکانیدا بەڵام ، پیاو هەر چەندە بـە ڕەچە ڵەك دووریش بێ لەو کەسانەی کە ئـەو لێ پرسـراوو بەخێوکـە ریتیـان ، هـەر لێ پرسراوو موکەڵەفی شەرعی‌یە ، بۆ هەڵسوکەوتی بەڕێوە بردن‌و پاردلێ خەرج کردنیان ، بـە تایبەتی ئـەو ژن‌و مناڵ‌و پیروپـەك کەوتووانـەی کـە کەس نی‌یە بەخێویان بکات •

ج ـ لێره دا دهربارهی کێشهی جیاوازی کردنی نێوان پیاوو ئافرهت لـه میراتیا لـه ڕژێمی پیرۆزی ئیسلام دا ، کێشه که لـه هاوکێشهیهکی بیرکاری دهچێ ، نهك کێشهیهکی بهزهیی هاتنـهوهو خۆشـهویستی دهروونیو داواکاریێکی ڕووت بێ بهڵێ ڕاسته ئـافرهت سێیهکی ماڵی میراتیا وهر دهگری بۆ ئـهوهی بهس تهنیـا بۆ خۆی بێو لـه خـۆی خـهرج بکات ، وه لـه ههمان کاتیش دا که پیاو دوو ئـهوهندهی ئافرهت وهردهگرێ ، بۆ ئهوهی به پلهی یهکهم لـه هاوسهرهکهی خـهرج بکا • وهدووهمینیش لـه خاوو خێزانو منداڵهکانی خهرج بکا •

لێـره دا کامیان قازانجیهتیو زیاتری بهردهکهوێ بـه کێشهیهکی هاو کێشهیی بیرکاری و ژمارهیی ؟ ههر چهنده حالاتی ناوێزه ڕوودهدا که پیاوی ئـهوتۆ دهبێ ، که لـه درێژایی ژیانیا ژن ناهێنێو ، بهس ئـهو پارهو پوولهی ههیهتی ههر له نهفسـی خۆیدا خهرجی دهکا ، بهڵام ، ئهمه شتێکی شهوازو ناوێزهیهو به دهگمهن وا ڕێك دهکهوێ که پیاوژن نـه هێنێ ، چونـکه لـه ڕاستیا ، ئـهگهر پیاو پیـاو بێ ، ئـهبێ ژن بهێنی و ئیـدارهی خاوو خێزانێك بـه ڕێوه ببات ، ئـهگـهر کۆسپو تـهگهرهو تـهنگو چهڵهمهیهکی ئـهوتۆ ڕێی نێ نهگرێ ، که نهتوانێ ژن بهێنی• وه ئـهگهر گریمان شتی واش ڕووی دا که پیاو ژنی نـه هێنـا ، ئـهوهش شتێکی شهوازه ، وه شهوازیش بنواشهی پێ ههڵناوه شتێهوه • چونـکه بـهرهی ڕاستو شتێکی سروشتی بێ ئهوهیه که ههر پیاو لهو داراییهی کـه ههیهتی ، لـه پێناوی ژنو خاوو خێزانو منداڵهکانیدا خـهرجی دهکـات • ئـهمهش نـهك ههربه ئـارهزوومه ندو پیاوهتی خـۆی بێ ، بهڵـکوو یاسای پیرۆزی ئیسلام ، لـه سهری پێ ویستو فهرز کردووه• وه لـه لایێـکی تریشهوه ، ههر چهنده ئافرهتیش ههر پارهو پوولێـکی

زۆری هەبێ ، هیچ لێ پرسراو نی یە ، هیچی بۆ پیاوەکـە خەرج بکات ، مەگەر بـە ئـارەزووی ڕەزامەندی خۆی نەبێ • بەڵام ، پیاو لە سەریەتی لـە ئیدارەی ماڵو خێزانو منداڵـەکانی ڕابگـرێ ، وە ئـافرەتیش بۆی هەیە کە شکایەت لـە پیاوەکەی بکا ، هەر کاتێك ، ئەگەر هاتوو وازی لە بـە خێو کردنی‌و هەڵسوڕانی بە ڕێوە بردنی ماڵەکەی هێنا ؛ یـا ئـەو کـە سانەی کە دەبێ پیاوەکە بە خێویان بکا بەڕێگایەکی شەرعی • ئـەو کـاتـە دادگا فەرمان دەردەکا ، پیاوەکە نا چار دەکا بە زۆر پارەی بەشی ئیدارە پێ کردنی ژنـەکە ، یـا منداڵەکانی ، یـا ئـەو کەسانەی کە ئەبێ ئـەو بـە خێویان بکا ، لێی بسێنسن ، یـا خود ئـەبێ دەست لە ژنەکەی هەڵـگرێ و مارەیەکە شی‌پێ بدات •

جـا لێرەدا ئێمـە ، ئـەم پرسیارەی خـوارەوە ئـاڕاسـتەی ئـەو کەسانە دەکەین کە دەڵێن : ئافرەت لـە بواری میراتیـا زۆر ستەم لـێ کراوو بەشی خوراوو مەغدوورە •

ئەگەر پیاوێك مردوو کوڕو کچێکی لە دوا بەجێما ؛ وە ماڵەکەیان بـە پێی شـەریعەتی ئیسلام لـە نێوانیاندا دا بەشی‌کرد ، وە لـە پاش چەند مانـگێـك کچەکە شووی کردو کوڕەکەش ژنی هێنا •

**ئایا لێرەدا کامیان زیاتر کەڵکی وەرگرتووە ، لـەو بەش‌و پارەو پوولەی کە وەریان گرتووە ؟**

لێرەدا ئـەگەر سـەرنـج بدەینـە ئـەم خاڵانـەی خـوارەوە ، ڕاستی کێشەکەمان بۆ ئاشکرا دەبێ :

١ ـ خۆ کچەکە کە شووی کردووە ، هیچ فلسێکی لـەو بـەش‌و پـارەو پوولەی کە لە میراتی باوکیا بـە بەری کەوتووە هیچی لێ خەرج

نـەکردووە ، بەڵـکوو پارەیەکی زۆریان تیـا خەرج کردووە بۆ سـاز کردنی گوازتنەوەو زەماوەندی •

۲ ــ خۆ کوڕەکەش پارەیەکی زۆری لەو پارەو پوولەی کـە لـە میراتی باوکی بەبەری کە وتووەو بۆی بەجێ ماوە خەرج کردووە • وە یـا خود زۆر جار وا دە بێ پارەکە هەندە کەمە هیچ کـەل‌و پەلێکی ژن گوازتنـەوەی پێ ساز ناکرێ ، وە یـا نـەگـەر پارە کـە زۆریش بـێ ئـەبێ پارەیەکی زۆر لـە ژن هێنانەکەی خەرج بکات •

لێـرە دا ئـەگەر بەراوردێ بەشی بەرکەوتنی میراتی هەردووکیان بکەین ، دە بینین پارەی ئـافرەتەکە ، هەر وەکوو خۆی ماوتەوە ، پارەی کوڕەکەش زۆری لێ خەرج کراوە ، وە یـا هەر بەشی هـە ئسوڕانی زەمـاوەندەکەشی نـە کردووە •

جـا لێرەدا لـە کوڕو کچە کە کامیان قـازانجیان زیاتر کردووەو میراتی یەکەیان بۆ ماوتـەوە ؟

خۆ خواوەند لـە هەموو کەس باشتر دە زانێ لـە چارە نووس‌و دوا ڕۆژ ئاری بەختەوەری هەردوو ڕەگەز ، وە هەرگیز نـا شیەوێ هیچ یەکێکیان لـە سەر حیسابی ئەویتر بەش خوراوو مەغدور بێ ، چونـکە خواوەند داد پەروەرێـکی ئـەو تۆیە کە هـەرگیز ستەم لـە بەنـدەی خۆی ناکا ، وە هەمیشە بە خشندەیی‌و میهرەبانی خۆی بە سەر بەندەکانی دادە بارێنی بەشێوەیێکی یەکسانی‌و داد پەروەری •

جـا لـە پاش ئەو هەموو بەڵـگەو نموونە هێنانەوە یەدا ، ئایا هیچ گومان‌و دوو دڵی‌یەك دەربارەی بەشی ڕاستەقینەی ئافرەت لـە سەر جەمی

سامانـی میراتیا مـاوه ؟

وه ئـایـا ئـهمـه ماف‌و هه‌قێكی تایبه‌تی ڕاسته‌قینه‌و داد پـه‌روه‌ری نی‌یه ، به‌پێی لێـك دانه‌وه‌یێكی بیر كـاری ئابووری ، كـه پیـاو دوو ئـه‌وه‌نده‌ی ئـافره‌ت لـه ماڵی میراتیا وه‌رگرێ ؟ كه‌وا ئـه‌و لێ‌پرسراوه بۆ هه‌ڵسوڕاندنی ئیش‌و كارو ئیداره‌ی ماڵ‌و مناڵ‌و پاره خه‌رج كـــردن ، لـه پێناوی بژێوی ژیانی ڕۆژانـه یان دا ، كه‌وا لـه هه‌مان كاتیش دا ئـافره‌ت لێ پرسراوی ئـه‌و ئـه‌رك‌و فرمان و پاره خه‌رج كـردنـانـــه نـی‌یـه ؟

بـه ڕاستی ئـه‌م ڕێـژه‌یه‌یی كه ئـافره‌ت به‌س لـه ماڵی میراتـی دا بـه بێ هیچ ڕه‌نج‌و كۆشش‌و هه‌وڵ‌و ته‌قه‌لادانێـك وه‌ری ده‌گـری ؛ ئـه‌وه باشترین‌و دادپه‌روه‌ترین یاسایه كه هه‌تاكوو ئێستا وولاته پێشكه‌وتوخوازه‌كان پێی گه‌یشتوونه‌و له‌سه‌ری ئه‌ڕۆن ، ئه‌ویش ئـه‌مه‌یه :

( هه‌ریه‌كێك به‌پێی هه‌وڵ دان‌و پێداویستی خۆی وه‌ری بگرێ ) .

وه لێره‌دا ئـه‌گه‌ر به‌راورده‌ی پێداویستی هه‌ردوو ڕه‌گه‌ز (پیاووژن) بكه‌ین ، ده‌بینین پیاو پێدا ویستی زیاتـره لـه ئـافره‌ت بـه پاره‌و پوول‌و دارایی هه‌یه ، به‌هۆی لـێ پرسراوی به‌رامبه‌ر به‌خاوو خێزان‌و به خێو كردنیان . چونـكه ئـافره‌ت به‌پێی شه‌ریعه‌تی پیرۆزی ئاینی ئیسـلام خۆیشی پیاو لێ پرسراوێتی‌و ئـه‌بێ به‌خێوی بكاو پاره‌و پوولی لێ خه‌رج بكا به‌گوێره‌ی ئـه‌و دارایی‌یه‌ی كـه هه‌یه‌تی ، وه ئـه‌و پـاره‌و پوول‌و كه‌ل‌و په‌لانه‌ی كه له ماڵی میراتیا وه‌ری ده‌گری به‌س بۆ نه‌فسی خۆێتی‌و له خۆی خه‌رجی ده‌كات . كه واته دادپه‌روه‌ری خوایی له وه دایه ، كه هـه‌ر یه‌كێك له‌م دوو ڕه‌گه‌زه ، ئـه‌بێ به ئـه‌ندازه‌ی پێداویستی خۆی لـه ماڵی میراتی وه‌ری گرێ ، نـه‌ك به پێی یاسایه‌كی هه‌ڕه‌مه‌كی‌و بـه

نادادپەروەرانــە • کە ئـافرەتیش وەك پیاو وەرگرێ • ئـەمما لەو ماڵو سامانو پارەو پوولانەی کە هەردوو ڕەگەز لـە بواری ڕەنجدان دەستیان دەکەوێ ، هەر یەکێکیان ئـەوەندەی دەستی بکەوێ هەر بۆخۆێتی • وە یـا هەر پارەو پوولێـکی لـە قـازانجی کڕینو فرۆشـتنو بازرگانیـا دەستیان کەوێ ، هــەر یەکەیان بۆ خۆیەتی بەبێ کەمو زیادەیی ، وە یـا لـە ڕێگای کرێی زەوی ، وە یا هەر شتێکی ترا • چونـکە ئەمە شێوازو ڕێبازێـکی تر وەر دەگرێ ، کە ئەویش یەکسانی ڕەنجدانو پاداشـتە • کـە واتــە هیچ ستەمو ستە مکاری یەك لـە ڕژێمی ئیسلام دا لـە ئافرەت نـە کراوە ، وە هیچ بـە شێکیشی نـە خوراوە ، وە کێشەکەش لە ڕاستیا لـە بنەڕەتـەوە وا نی‌یە ، هەر وەکوو زۆر لـە نەزانو گومڕابووەکان ، واتێ گەیشتوون کە دەڵێن : )( نرخو ڕێزی ئـافرەت لـە کۆمەڵـگای ئیسـلام دا نیو ئـەوەندەی نرخوڕێزی پیاوە ، بـە هۆی ئـەوەی کەپیاو دوو ئـەوەندەی ئـافرەت لـە بەشی ماڵی میراتیا وەر دەر دەگرێ ) •

هەتاکوو زۆر لـە نەزانو نەفامە موسڵمانەکانیش وا تێ گەیشتوونە، وەهەتـا گەلێك لـە هەرزەگۆیــە ناموسڵمانە کانی دوژمنانی ئیسلامیش لـە سەر هەمان بەزمی بیرو ڕاو بۆ چوون هە ڵدەپەڕنو هەمیشــە وەك بنیشـتە خۆشە دەی‌جوونو دەی جوونەوە ، بەبێ ئـەوەی لـە ڕاسـتی کێشــە کە تێ گە یشتبن و بیانەوێ تێ‌ی بگەن •

( ٢ )

## شایەتی دانی پیاوو ئافرەت لە شەریعەتی ئیسلامدا

١ ـ شایەتی دان بریتی‌یە لـە چی‌یو مەرجی شاهید چی‌یە ؟

٢ ـ ئایا شایەتی دوو ئافرەت بەرامبەر شایەتی دانی یەك پیـاو ،

مـانـای ئەوەیە کە ئافرەتێك نیو ئەوەندەی پیاوێکە لـە باری کۆمەڵایەتی ئیســـلام دا ؟

بـە ڕاستی ئـەگەر بیر لـە فەلسەفەی شایەتی بکەینەوە ، دەبینین شایەتی لـە یاساو ڕێبازی پیرۆزی ئیسلام دا کێشـە یەکی یـەکجـار فرە گرنگە ، وە هەر لەبەر ئـەوەیە لـە شەرعدا زۆر گرنگی پێ دراوە •

شایەتی لـە شەریعەتی ئیسلام دا بریتییە لەوو کە ئاگا (خەبەر) بدا لـە مافێ کە بە سەر کە سێکەوە بێ بە بێژەی تایبەتی •

وە مـەرجی شایەتیش ئـەوەیە کە هۆشمەندو پێگە یشتوو (بالغ) و ئـازادو خاوەن پیاوەتیو فامیدەی هەستو هۆشی کارو باری دنیاو ئایینی خۆی بێ ، وە لـە هەر شتێکدا کە ببیسرێ ، پێویستە گوێی بێو لـە شەهادەتەکە یشیدا تاوانبار نـەبێ •

گەلێ لـە گەورە زانایانی شەرع وەکوو ( ئـەوزەعی )و ( غزی )و زۆر کەسانی تریش فەرموودەی چـەند لـە زانایانی ڕێبـازی پێشـەوا ( مالکیان ) هەلبژاردووە کە فەرموویانە لە کاتو چاخێکدا کـە خراپـەو نـافـەرمانیو داوین پیسی بڵاو بوو بێتەوە لـە وولاتدا ، فەرمانڕەوای شەرع ئەتوانێ فـەرمان بدا لـە سەر شایەتی شاهیدی بەندەی نافەرمان ( فاسق ) • بەڵام ، پێویستە سەیری ئـەوە بکرێ شـاهیدی کـە فاسقی یەکەی کە متربێ ، شایەتی یەکەی پێش بخرێ لـە شاهیدێ کە فاسقی یەکەی زۆر تربێ •

جـا هـەر لەبەر ئـەم مەبەستانەی سەرەوەیە ، خوا لـە سـوورەتی ( بەقەرە ) لـە ئـایەتی (٢٨١) دا دەفەرمووی :

**« يا أيها الذين آمنوا اذا تداينتم بدين الى أجل مسمى فاكتبوه ، وليكتب بينكم كاتب بالعدل ، ولا يأب كاتب أن يكتب كما علمه الله ، فليكتب وليملل الذي عليه الحق ، وليتق الله ربه ، ولا يبخس منه شيئاً ، فان كان الذي عليه الحق سفيها أو ضعيفا ، أو لا يستطيع أن يمل هو فاليملل وليه بالعدل ، واستشهدوا شهيدين من رجالكم ، فان لم يكونا رجلين فرجل وامرأتان ممن ترضون من الشهداء أن تضل احداهما فتذكر احداهما الاخرى ، ولا يأب الشهداء اذا ما دعوا ، ولا تسأموا أن تكتبوه صغيرا أو كبيرا الى اجله ، ذلكم اقسط عند الله ، واقوم للشهادة ، وادنى جناح الا تكتبوها ، واشهدوا اذا تبايعتم ، ولا يضار كاتب ولا شهيد ، الا ترتابوا ، الا ان تكون تجارة حاضرة تديرونها بينكم ، فليس عليكم وان تفعلوا فانه فسوق بكم واتقوا الله ، ويعلمكم الله ، والله بكل شيء عليم » .**

واتـه : ئـەی ئـەوانەی کە بڕواتان هێناوە ، کاتێك کە کڕینو فرۆشتنتان کردووە ، یـا هەر کارێـکی تری لەم بابەتەتان کرد ، بـە قەرز بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بی‌نووسن ، وە بـا لـە ناوتانا نووسـەرێك بـە ڕاستی بی‌نووسێ ، وەهیچ نووسەرێك با لـە نووسینی دا سەرپێچی نەکا ، وەك خوا ئـەوی فێری نووسین کردووە وەبا ئەو کەسەی کە قـەرزەکەی بـە سەرەوەیە دەقی سەنەدەکە بڵێ ، وە لە خوابترسێ ، وە هیچی لـێ کەم نەکاتەوە ، ئنجا ئـەگەر ئـەو کەسەی قەرزەکەی بـە سـەردوەیە بێ عەقڵ ، یا ناتەواو بێ‌و ، یانەی ئـەتوانێ خۆی دەقی سەنەدەکە بڵێ ، بـا گەورەکەی بیڵێ بە ڕاستیو ، وە دوو شاهێد بگرن لـە پیاوانی خۆتان، ئنجا ئـەگەر دوو پیاو نەبوو بـا پیاوێكو دوو ئـافرەت بن لە وانەی کـە پەسندیان بکەن تـا ئـەگەر یەکێکیان فەرامۆشی کرد ئـەویتریان بسری بخاتەوە ، بـا ئاگادارەکان ( شاهێدەکان ) سەر پێچی نەکەن کاتێك بانگ کـران بۆ هەڵگرتنی شەهادەت ، باسستیو کەم تەرخەمی نەکەن لەوەی کە دەی‌نووسن کەم بێ یا زۆر تـا کاتی خۆی ، ئـەم نووسینەتان ڕاست

تره لای خوا ، وه دروست تره بۆ شەهادەتدان ، و نزیکتره بۆ ئـەوەی که نـەکەونه گومانەوە ، مەگەر کاتێك ئـەو کردەوەیه بازرگانی یـەك بێت لـه نێوانتانـا ئـەوسـا دەست بـه دەست بێ بی گێڕن لـه ناو خۆتانا، لـەم کاتـەدا گوناهتان ناگا ئەگەر نـه ینووسن ، وه شاهێد بگرن کاتێك که کڕین‌و فرۆشتنتان کرد ، وه زیان بـا بەشاهێدو نووسەر نەگەیەندرێ، وه ئەگەر زیانتان پێ گەیاندن بێ گومان گوناهتان ئەگا ، وه له خوا بترسن، وه خوا قـازانجی خۆتان فێر ئەکا ، وه خوا به گشت شتێك دەزانـێ‌و ئـەنجامی هەموو کارێکی لا ئاشکرایه •

بەڕاستی زۆر لەو هەرزه گۆیانه لـه ناو موسڵمان‌و ناموسڵمانه کاندا لـه دژی ئـەوەنـه کـه دوو ژن چۆن ئەبێ بەرامبەر یەك پیـاو بێ لـه شـەریعەتی ئیسلام دا • بەڵام ئەوانه وا دیـاره که لەفەلسـەفەی مانای شەهادەت‌و شاهێدی نـه گەیشتوونه ، وه له هەمان کاتیش دا له فەلسەفەی ئـەو دوو ئـافرەتەی که بەرامبەر یەك پیاو لـه شاهیدیـا دا ئـەنـرێن نـه گەیشتوونه ، چونـکه ئـەگەر کەمێك تێی بگەیشتنایه ، هـەرگیز ئـەو بیره پڕو پووچەیان بەبیردا نەدەهات که ئـەمه مانای ئـەمەیه که ( ئـافرەتێك یەکسانه بـه نیو پیاو ، یـا خود دوو ئافرەت یەکسـانن بـه یـەك پیاو ) •

جـا لێرەدا بـابگەڕێنەوه سەر باسی شەهادەت‌و شایەتی دوو ئافرەت کـه لـه شەریعەتی ئیسلام دا یەکسانه بـه شایەتی یەك پیـاو وه شیشی بکەینەوه بـه شی‌کردنەوەیەکی زانستیانه و ، وه بـه بەڵـگەی سەلمێنـه ریش بـه ناحەزانی ئیسلامی بسەلمێنین که ئـەو مانـایەی ئـەوان بۆی چووینه لـه کێشەی شەهادەت‌و شایەتی‌دا زۆر به هەڵەدا چوون •

چونکە بەڕاستی هەموو کڕینو فرۆشتنێکی گرنگ لەهەموو چاخو شوێنێکدا دوو شاهێدی ئەوێ هەر وەکوو خوا ئەفەرموێ :

( واستشهدوا شهيدين من رجالكم )

دوو شاهێد بگرن بۆ هەموو کڕینو فرۆشتنێکی گرنگ لە پیاوانی خۆتان ، واتە لە موسڵمانانی ئازادی باڵغ • ( فان لم يكونا رجلين ) ئەگەر ئەو دوو پیاوە دەست نەکەوت ، ( فرجل وامرأتان ) با پیاوێكو دوو ئافرەت شاهێد بن ، ( ممن ترضون من الشهداء ) لە وکەسانەی کە پەسەندیان بکەن ، وە لە ئاینو دادو داد پەروەرییان ڕازیی بن جا خواوەندی گەورە هەر بە خۆی بەڵگە ئەهێنێتەوە لە سەر ئەوەی کە بۆ چی وە لەبەر چ هۆیەك دوو ئافرەت لە جێی پیاوێکن ئەفەرموێ: ( أن تضل احداهما ) لە ترسی ئەوەی ئەگەر یەکێك لەو دوو ئافرەتە ئەو شایەتی‌یەی لە بیر چووبوو ، هەمووی یا کەمێکی ، (فتذكر احداهما الأخرى ) یەکێك لەوانە ، هەر کامێکیان بێ کە لە بیری ما بێ ، یادی ئەویەکەی تریانی بخاتەوە •

کەواتە فەلسەفەی شەهادەتی ئەو دوو ئافرەتە ، ئەوەیە کە ئەگەر یەکێکیان شتێکی لە ناوەڕۆکی شەهادەت نامەکە لە بیر چوو ئەو یتریان بە یادی بخاتەوە ، نەك مانای ئەوە بێ کە لەبەر بێ نرخیو بێ ڕێزی یان بێ کە دووانیان بەرامبەر شایەتی یەك پیاو دانراون •

جا هەر وەك لێرەدا دوو ئافرەت بە پیاوێك دا ئەنرێ لە شایەتیا ، هەر وەها لە زۆر شوێنی واش هەیە کە ئافرەتی بە دوو پیاوە، وەك شایەتی ئافرەتێك لە سەر کچێتی کچێك ، یا لە سەر بوونی منداڵ ، یا لە سەر ژیانی منداڵێك لە کن بوونی ، یا لەسەر زۆر شتی تری لەم بابەتانەوە •

جا هەر لە سەرەتاوە ، ئەم بەڵگەیە بۆ چوونەکەیان پووچەڵ

دەکاتـەوە • ئەمجا خۆ ئەگەر لێرەدا بە پێی بۆ چوونەکەی ئەو هەرزە گۆیانـە بێ ، دەبێ دوو پیاویش یەکسان بن بەیەك ئافرەت لە تەرازووی عەقڵو مەنتیقی ئـەو جۆرە کەسانەدا •

( **شایەت دانی دوو ئافرەت لەبەر دەم دادگاکاندا** ) ئەگەر سەردانێکی دادگایەك لـە دادگاکان بکەین ، دەبینین دادگەر لە کاتی **دادوەری‌دا هەر** دوو شایەتە ئافرەتەکە لە تەنیشت یەکەوە ڕادەگرێ ، وە پرسیار ئاڕاستەی یەکێـکیان ئـەکات بـە ئامادەبوونی ئـەو یتریان ، وە قسەیەك ئـەگـەر یەکێـکیان شەهادەتی لەسەر نیوەی داو ، ئـەویتریان شەهادەتی لەسەر نیوەکەی تری‌دا ، لێی قـەبوول دەکرێ ، بەڵام پیاو ئـەبێ یەکە یەکە ڕابگیرێ و شەهادەتیان وەربگیرێ ، حـۆ ئـەگـەر هاتـوو پیـاوێـك شەهادەتەکەی بۆ تەواو نەکرا ، وە بێژەیەك وە یا چەند بێژەیەکی وا کە بیڵێو نـەیزانی بیڵـێ یـا لـە یـادی کـرد ، ئەوکاتە شـاهادەتـەکەی لـێ وەرناگیرێ با هـەر چـەندە شاهێـدەکـەی تر لە شـەهادەتەکەیا شـەهادەتەکەیا ئـەو قســەیەش بڵێ ، چونکە بە شـەهادەتی کەسـیان ، شـەهادەتی ئەویتریان تەواو ناکرێ ، بەڵام ، لـە هەمان کاتیش‌دا شایەتی ئـافرەت وا نی‌یە •

لێرەدا ئـەگەر ئـەم پرسیارە ئـاڕاستەی خوێنەران بکەین و بڵێین : ئـایـا بۆچی شایەتی ئـافرەت و پیاو لێرەدا وایە ؟

١ ـ چونـکە بـە زۆری ئافرەت خەریك نابێ بە حیساباتی پارەو پوولو قـەرزو تۆڵو کڕینو فرۆشتن و ئەم جۆرە کارو فرمانانە ، لەبەر ئـەوە هەستو یادو بیرو هۆشی لەم بارەیەوە کزە ، بەڵام ، لـە بـارەی منـاڵ بـە خێوکردنو پەروەردەکردنو کاروباری ناوماڵ ، ئـافـرەت هۆش و یادو بیری لـە پیاو پترە ، چونـکە ئەمە شتێکی سروشتی‌یـەو ، وە دابو نـەریتی ئافرەت وایە کە هەر خولیاو سۆزو هەستو نـەستی

لـە لای ئیش و کاری نـاو ماڵو منالەوە بێت ، چونکە ئـەمە شـتێکی دەروونی یەو هەرگیز ناگۆڕدرێ • بە کورتی ئـادەمیـزاد چ پیـاو یـا ئـافرەت چی زۆر ئـارەزوو مەبەست بێ و لەگەڵیا زۆر تـێکەڵو خەریك بێ ، بیرو هۆشی تیا زیادو بەهێزو زەینیشی تیـا ڕوون ئەبێ •

بـەڵام ، کارکردنی هەندێك لـە ئافرەتـان لـەم سـەردەمەدا لـە بانقـەکاند کە خەریك دەبێ بە ئیش وکاری مامەڵەکردنی پارەو پوولەوە، ئـەم فرمان و کارە هیچ لـە یاساکە ناگۆڕێ ، چونـکە یاساکە بۆ بەشی زۆری کۆمەڵانی خەڵك دا دەنرێ ، نەك بۆ کۆمەڵێـکی کەم •

جا کە ئـەو ئـافرەتانەی کە لەم چاخەدا کە لـەگەڵ پارەوپوولی بانقـەکان خەریك دەبن ، وەیا دەبنە بەڕێوەبەری بانقەکان ، وەیا دەبـە ژمێریار ، یـا لەمەیدانی ژمێریاری دا ئیش دەکەن ، بەرامبەر زوربـەی زۆری پیاوان زۆر کەمن لەهەموو شوێنو نەتەوەیـێکدا •

**( بیروباوەڕی هێندێ لە زانایانی ئەوروپا دەربارەی زەین وبیرو ئامێزی ئافرەت )**

ئـەگەر گەشتێك بەناو پەڕتووکە زانسیەکانی زانایانی ئـەوروپا بکەین ، دەبینین زۆریـان دەربارەی زەین و بیرو داوێنی ئافرەتیان نووسیوەو ، وە گەیشتونەتە ئـەو بڕواو قەناعەتە کە زەینی ئافرەت کزترو بێ هێزترە لـە زەینی پیـاو ، وە ئافرەت بـە زۆری شتو ڕووداوی زووتر لەپیـاو لـە یاد دەچێتـەوە ، ئـەوە دکتۆر ( ئونوفینجەر ) کەپێتۆلێکی نەمساوی یە لـە پەڕتووکێکیا کە ناوی ( الجنس والاخلاق )ە ، لەلاپەڕە (٩٤-١١٦)دا دەڵـێ بیرکەوتنەوە ، هێنـانـەوە یادی شـتی ڕابووردووە ، وە حـازر کردنێتی لـە زەین‌دا ، وە ژن ناتوانێ لەبەرچـەند هۆیەکی ئـەندامی و

دەروونی ئـەم بەهرەیە پەیدا بکات ، چونکە ژیانی ئافرەت پچڕ پچڕە ، ئـەمانـەی بیر ناکەوێتـەوە کەمێکی نەبێ ، هـەر وەك فـەرموودەی :

( ان تضل احداهما فتذكر احداهما الاخرى )

گەیاندی ، بەڵام ، پیـاو وا نییە ، وە ئەتوانێ دوای زنجیرەی ژیـانی خـۆی بکەوێ ئـەلقـە ئـەلقـە ، وەشتی گرنگی ئـەو بەسەر هاتـەی لە بیر ناچێتەوە لـە هیچ کاتێـکا بەڵکو ئـەم زانـاو فەیلەسووفە بڕیـاری داوە ، لەو پەڕتووکە دا کەهێزی ئـەقڵی ئـافرەت بێهێزە ، وە لە لاپەڕە ( ٧٦-٨٤ )دا ئەڵێ : ناگونجێ بۆ ئافرەت جیاکردنەوە لـە نێوان هەستو بیرا ، واتـە ژیانی ویژدانیو ئەقڵی لە یەك جیاناکاتەوە ، بەڵام ، پیـاو زۆر چاك جیایان ئەکاتەوە • لەلاپەڕە ( ٨٥-٩٣ )دا ئەڵێ : هەڵکەوتوویی یەکێکە لەو سیفەتانـە کەپیاو لەژن هەڵداوێرێ ، وەنـاگونجێ ئـافرەت بـگاتـە ئـەو پایەیە ، بـا خوێندەوارو بـە بەهرەش بێ •

تێبینی : ئـەم باسە بەدەستکارییەوە لەجزمیسیهەمی ، تـەفسیری حاڵ وەرگیراوە ، کە ئەویش لـە ژمارە هەشتی بەرگی یەکەمی گۆڤاری ( نور الاسلام )ی زانکوێ ئەزهەری ساڵی ١٣٤٩ی کۆچی وەرگرتووە •

**ئایا سروشتی سۆزی دایکایەتی دەبێتە هۆیەکی کاریگەر بۆ ئەوەی ئافرەت شایەتییەکەی بگۆڕێ ؟**

بـەڵێ ، سروشتی دەروونی سـۆزی دایکایەتی ئافرەت زۆر کـار دەکاتـە سەر هەستو نەستو بیرو هۆشی ئافرەت ، کە وای لـێ بکات لـە کاتی شایەتیدانی لەسەر لاوێکی شۆخوشەنگ یـا کچێکی نازداردا ، سروشتی سۆزی دەروونی وای لێ بکات کە شایەتییەکەی بگۆڕی ، بۆ

بـەرژەوەندی تاوانبارەکان ، یاخود سۆزی دڵسـۆزی‌و خۆشـەویستی دایکایەتی کاری لێ بکات کە شایەتی‌یـەکـە نـەدا ، یاخـود بیگلۆڕێ ، چونکە هەر شتێکی سروشتی‌یە ، کە ئافرەت هەست‌و نەست‌و بیروهۆشی زۆر ناسکە ، وەهەر بە ڕووداوێکی کەم ، کار دەکاتـە سـەر هەست‌و نەستی ، بەڵام ئەگەر دوو ئافرەت پێکەوە لەشایەتیەکدا کۆببنـەوە ، زۆر دوور وشتێکی نەبوون‌و نابایی‌یە کە هەردووکیان لەسەر یەك بیروڕا ، وە یـا یەك بڕیار ڕێك بکەون ، وەیا یەکێکیان ئەمیەتی ئـەویتریان بەتـاڵ‌و پووچەڵ نەکاتەوە ، ئـەگەر هاتوو لـە ڕاستیا لایی‌دا •

جـا ئـەمەش بەڵـگەیەکـە لـە بەڵـگەکانی دوو ئـافرەت لـــە شـــەهادەتـا بەرامبەر یـەك پیـاو کە دانراون لـە شـــەریعەتی پیرۆزی ئیسـلامدا •

وە هەروەها یەکێك لە زانایان ووتوویەتی :

( المرأة متقلبة كالزمن )

واتــە : ئافرەت هەردەم لەسەر نەوەرەیەکەو چـەشـنی ڕۆژگار لەگۆڕاندایە • مەبەست لەوەیە کەخاوەنی سروشتێکی نـەگۆڕ نی‌یـە ، ئـەمـەش بەهۆی گەلێ هۆی تایبەتی‌یەوە کە لێرەدا مەودای باس‌کردنیان نی‌یـە •

( دەسەڵات دارێتی پیاوان لەسەر ئافرەتان )

بۆچی خواوەندی گەورە دەسەڵاتی سەرکردایەتی داوتە پیاوان ، کە چاودێری ئافرەتان بکەن‌و ، وە ناویشیان دەبا بەهێزو تواناتر لەوان ؟

لێرەدا پێش ئـەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە ، پێویســتە بگەڕێنـەوە سەر بنەڕەتی کێشـەکە ، ئنجا بگەڕێنـەوە سـەر وەڵامـی پرسیارەکـە •

بەڕاستی هەناکو ئێستەش ، زۆر لەو کەسانە لە مانا و هودەی سوورەو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز نەیشتوونە ، کە بۆ بەرزەوەندی گشت ئادەمیزادی سەر ئەم زەمینە چ پیاو یا ئافرەت هاتوونەتە خوارەوە ، جا هەر ئایەتێك وە یا سوورەتێك بۆ مەبەستێك ، وە یا چەند مەبەستێکی تایبەتی هاتووتە خوارەوە • ئنجا ئەگەر یەکێك بیەوێ ماناپان بە تەواوی تێبگات ، پێویستە پەرتووکە ڕاڤەکارییەکانی ، جۆراوجۆری قورئانی پیرۆز بخوێنێتەوە ، وە ئەو پەرتووکانەی دەربارەی ، ئەم بابەتانەش نووسراون ( کە بۆ دەسەلاتی هەلسوڕاندنی کارو باری ماڵو منال دراوتە پیاوان ) ، تا سەردەری لە مانای ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان دەربکا ، وە یا بە خوێندن بیان خوێنێ ، چونکە زۆر کەس هەیە لەم سەردەمەدا زۆر باش شارەزای زمانی عەرەبی نییە • جا بە ئاسانی ناتوانێ لە مانای قورئان تێبگات ، ئەگەر لە لای مامۆستای زۆر زاناو دانای ئایینی نەخوێنیو ئەو مانای بۆ لێك نەداتەوە • جا کە خواوەندی مەزن لە سوورەتی ( النساء ) لە ئایەتی (٣٤)دا دەفەرمووێ :

**« الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض وبما أنفقوا من أموالهم »** •

واتە : **خواوەندی** گەورە پیاوانی کردوون بە خاوەن دەسەلاتو گەورەو چاودێری کەری ئافرەتان بەهۆی دووشتەوە :

أ ـ یەکەمیان بە هۆی هێزو توانایی ئەندامەکانی لەشی پیاوان لە کارکردنو بەرگری کردن لە خێزان و نیشتمان •

ب ـ دووەمیان ئەوەیە کە پیاوان ئیدارەی بژێوی ڕۆژانەی خێزانەکانیان هەڵدەسوڕێنن ولێپرسراون بە خەرج کردنی پارەوپوول لە پێناو ژیانی ڕۆژانەو بەختوکردنیان و بەڕێوەبردنی کاروباریان ،

وەمارەیی بە ژنان‌دان‌و خۆگرتن و ئارام گرتیان لەسەر ئەو تەنگ‌و چەڵەمەو کۆسپانەی کە دێتە سەرێگای ژیانیان •

ئەمجا لێرەدا دیسان ، ئەگەر بە چاوی ئەقڵ‌و مەنتیق ووردبینەوە لە کێشەی دەسەڵات‌دانی هەڵسوڕاندنی کاروبارو ئیدارەی خاوخێزان کە لەئەستۆی پیاو دان‌و نەخراوتە ئەستۆی ژن و لەقورئانیش‌دا واهاتووە کە پیاو بە توانا ترن لە ئافرەت ، ئەم ڕاستیانەی خوارەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ :

١ ـ هەر لە سروشتەوە کە خواوەند ئەم ڕەگەزەی دروست کردووە ، جەستەی پیاوی لە جەستەی ئافرەت بەهێزترو بە تواناتر دروست کردووە ، هەر لەبەر ئەوەیە پیاو زیاتر دەتوانێ خۆی بگرێ بەرامبەر هەموو ئیش و کارو کارەسات و هێزێک‌دا بەهۆی هێزو توانایی لەش‌و ئەقڵی‌یەوە •

٢ ـ هەر لە سروشتەوە هۆش‌و بیرو ئەندێشەی پیاو بەهێزترە لە هی ئافرەت •

٣ ـ هەر لە سروشتەوە ئافرەت هەست‌و نەستی ناسک‌ترە لە هی پیاو ، هەر لەبەر ئەوەیە ئافرەت هەر لەخۆیەوە حەز لە منال بەخێوکردن‌و ئیش‌وکاری ناومال‌و ئەو جۆرە ئیش‌وکارانە دەکات ، بەهۆی هەست نەرمی‌و بە ئارامی‌و میهرەبانی‌و دڵسۆزی‌یەوە بەرامبەر منالەکانی • لێرەدا دیسان دەمەوێ ئەم پرسیارە ئاڕاستەی ئەو خوێنەرانە بکەم ، کەخاوەنی ژیری‌و هۆشن ، وە لەهەمان کاتیش‌دا هەر خۆیان بکەم بە ناوبژیکەر :

ئایا بژێوی خاوخێزان بدرێتە دەست پیاو باشترە یاخود ئافرەت ؟

وە ئایا کامیان بـە توانـاترو بـە هێزترن بۆ ئیش‌و کارو بەڕێوەبردنی و ماڵ‌و منداڵ‌و بەرگری کردن لێیان ؟ وە ئایا پەروەردە کردن‌و بەخێوکردنی منداڵ بدرێتە دەست کام ڕەگەز لە پیاوو ژن باشترە ؟

لێرەدا ئـەگەر بـە چاوی ئەقڵ و مـەنتیق بیر لـەم پرسیارانەی سـەرەوە بکەینەوە و خۆمان لانەدەین لـە هەق‌و ڕاستی‌و نەکەوینە دوا هـەواو هەوەسی نەفس‌و لاڕی نەگرین • بۆمان دەردەکەوی کەوا کام ڕەگەز شایانی کام کارو پیشەیە •

بەڕاستی کە خواوەندی گەورە دەفەرمووێ : « الرِّجالُ قوامون علی النسـاء ••• » • ئەمە ووتەیەکی هەڕەمەکی و بێهودە نی‌یە ، ئەم فـەرموودەیە ، هی ئـەو پەروەردگارەیە کە پیـاوو ئـافرەتی دروسـت کردووە ، وە هەر بەخۆی لە هەموو کەسێك باشتر دەزانێ ، کـامیـان شـیاو و لێوەشاوەی کام کارن • چونکە هەر دروستکەرێك لـە هـــەر شـتێکا دروست‌کراوەکەی ، ئـەو باشـتر لـە خـەڵکی تر دەزانێ ، ئـەو ئامراز و ئامێرانەی کە دروستی کردووە ، کامیان بۆ کام شت بەکار دێ ، وە ئەویتریان خراپترە ، ئەگەر لـە کارێکی‌تر بە کار بێ •

جـا خواوەندی گەورە کە ئادەمیزادی دروست کردووە ، پیـاوی هـەر لـە سروشتەوە ، بۆ ئیدارە هەڵسوڕانی کارو باری ماڵ و منـاڵ‌و بەرگری کردن لێیان دروست کـردووە ، وە بەرامبەر ئـەو ئـەرکـەی کە پێی سپاردووە ، هێزو توانایی جەستەیی‌و ئەقلیشی زیاتر پێ بەخشیوە ، بەباشی بتوانێ بەو کارو ئەرکانە هەڵسێ ، وە ئافرەتیشی بـە پلـەی یەکەم بومناڵ بەخێوکردن و پەروەردەکردن و ئیش‌و کارکـردنی نـاو مـاڵ دروست کردووە ، سەرە ڕای ئیش‌و کاری‌تر • لێرەدا ئـەم قسەیە ئـەوە ناگەیەنێ کەوا ئـافرەت هەر بۆ ئـەم کارانە بەس دروست کراوەو

نابێ هیچ ئیش‌و کارێـکی تربکات ، نەخێر وانی‌یـە ، بەڵـکو سەرەڕای ئـەمـانـەش ئـەگەر پێ‌ی‌کراو لـە توانای‌دا هـەبوو ، پێویســـــتە کـەم تەرخەمی نەکا ، لەهەر ئیش‌و کارێـکی تر کـە بتوانـی بیکا ، وە بەپێ‌ی پێویست‌و توانـا ، یارمەتی هاوسەرەکەشی بـدا .

بەڵام ، ئیشی سەرەکی‌و تایبەتی ئـەم دوو ڕەگەزەکە لە سروشتەوە لـە خولیاو بیرو هۆش‌و هـەست‌و نەستیان‌دا هەڵقوڵێ ، وەهەر لە ئەڵ دروست بوونیان خوویان پێوەگرتووە ، ئـەوانە بوون کە باسمان کردن .

جـا ئـەگەر پیاوێك هەستێ منالٚ بە خێو بکاو ئیش‌و کاری نـاو مـاڵ بکا ، وە یـا چێشت لێ‌بنێ ، وە ئافرەتێکیش بچێ ئیش‌و کاری جووت‌و دروێنـە بکا ، وەیا ببێ بـە سەربازو ئەفسەرو فرۆکەوان ، ئەم کارانـە هیچ شتێك لـە کێشەکـەمان کەم ناکەنـەوە ، چونـکە هەر یاسایەك بۆ زۆری شت دادەنرێ ، وە ئەگەر هاتوو چەند ناوێزەیەکی تێـدا ڕووی‌دا، ئـەم کاتـە یاساکە بەم چەند ناوێزانە هەڵناوەشێنەوە ، چونکە ئـەوانـە کەمایەتین‌و گرنگ دەستوورە گشتی‌یەکەیە .

جـا لێرەدا دیسان ، ئەگەر بگەڕێنەوە سەر هـەمان کێشـەو ئـەم پرسیارانەش جارێـکی تر ئـاراستەی خوێنەران بکەین‌و بڵێین :

ئـایـا هەر وولاتێك ئەگەر یاساو ســەرکـردەیەکی لـێ هاتووی نـەبێ ئـەو کاتە ئاژاوەو پشێوی سەراسەری ئـەم وولاتە ناگرێتەوە ؟ وە ئـایـا هیچ فەرمانگاو شەریکەو قوتابخانەیەك لە گێتی‌دا هەیەو ئەگونجێ بـەڕێوەبـەرێـکی تایبەتی نەبێ ؟ وە ئایا هەر شەریکەیەك ، ئـەگەر هاتوو بـەڕێوەبـەرەکەی مرۆڤێـکی لێ‌هاتوو نەبوو ، ئـەو شەریکانە لە ئەنجاما دووچاری زیان‌و زەرەرێـکی زۆر نابێ ، یا خود پێش دەکەوێ‌و سوودو قـازانجێـکی زۆر ئـەکات ؟

گریمان دوو شەریکە سەکر لـە شارەکەماندا هەبوو ، یەکێکیان بـەڕێوەبەرێـکی یـەکجار لـێهاتوو شـارەزاو ئـیداری هـەبوو ، وە ئـەویتریشیان بەڕێوەبەرێـکی لێ نەهاتوو کەمتەرخەمی هەبوو ، ئـایـا کامیان پێش دەکەوێ و قـازانج زۆرتر دەکا ؟ .

لێرەشدا هەر وەکوو بەڕێوەبـەرە ئـیدارییـەکان ، ئـەگـەر بەرپرسیاری کاری ماڵو خێزان بدرێتە دەست ئافرەتان ، بێ گومان پشێوی وو ناکۆکی ڕوو دەکاتە نـاو ئـەو خێزانـانەی کە ئیشو کارەکانیـان ئـەوان بەڕێوەی دەبەن . خۆ ئـەگەر چەند ئافرەتێـکی لێهاتوو ئیشو کاری ماڵیان گرتە ئەستۆو زۆر بـە باشی ئیش و فرمانی ماڵەکانیان بەڕێوە برد ، ئەمە تێوری ئەم یاسەمان هەڵناوەشێنێتەوە ، چونکە وادەبێ کە نافرەتی وا هەڵدەکەوێ لەکۆمەڵدا کە بە دەگمەن پیاوی ئـەوها هەڵبکەوێ ، جـا هەر وەکو و ووتمان یاسا بۆ گشتی دانراوە نەك بۆ کەمایەتی ، خۆ هـەر وەکوو ئاشکرایە ، زوربەی زۆری ئافرەتانیش توانایی پیاوانیان نییە لـە زۆر ئیشو فرماناندا . چونکە هەر یەکێـکیان بـەم دوو ڕەگـەزەدا بۆ ئیشو کارێـکی تایبەتی خۆیان دروست کراون ، جا ئـەگەر یەکێکیان لـە ئیش و کارێك کەم دەسەڵات و بێ توانابن بێ لەوەی تریان ، ئەمە وا ناگەیەنی ئـەم ڕەگەزەیان لەبەر بێ نرخیو کـەم ڕێزی بایـەخی پێ نـەدراوە ، وە یاخود توانایی ئـەم کارەی پێ نـەدراوە . نەخێر ئەمە بۆ هەڵسوڕاندنی ئیش و کاری دنیایییە ، بەڵام ، لەلایەن یەزدانو لـە ڕۆژی قیامەت هەر دوو ڕەگەز بـەبێ جیـاوازی سـەیریـان دەکـرێو پاداشتیان بەپێی کردەوە باشەکانیان پێ دەبەخشرێ یا سزایان ئەدرێ .

جـا کـە پیاو کارگێریو دەسەڵاتی هەڵسوڕاندنی ئیشوکاری ماڵ و خێزانی پێسپێراوە، ئەمە مانای ئەمە نییە کە دەستی ستەم و ستەمکاری و

زۆرداری ، بو هاوسەرەکەی درێژبکاو بەخراپی ڕەفتاری لەگـەڵ بـکاو بیچەوسێنێتەوە ، یـا ئیش‌وکاری ماڵو خێزانەکەی بە خراپی بـەڕێوە بـبات ، خۆ ئـەم سەرکاری‌و سەرکردەیی‌یە ، بۆ ئـەوە نی‌یە کە پیـاو لـە ئیش‌و کاری‌و ماڵ خێـزان پرس‌وڕا بـە هاوسـەرەکـەی نـەکاو ، بەدادپەروەری ڕەفتاری لەگەڵ نەکا ، وە هەر بە پێی بۆ چوونو بیرو باوەڕی خۆی ڕەفتارو کردەوەو کـار بـکات ، بەڵـکو سـەرکـردەی سەرکەوتوو ، ئـەو سەرکردەیەیە کە لەگەڵ هاوسەری ژیانی زۆر ڕێك‌و پێك و گونجانیان لـە ڕادەیەکی‌وا دابێت کە لەئیش‌و کارەکانی ڕۆژانەی ژیانی‌دا پرس بـە هاوسەرەکەی بکاو ڕای وەرگرێ ، تـا ئەویش هەست بەبوونی خۆی بکاو هەست بەکەم دەسەلاتی خۆی نـەکاو بلێ مـن هیچ بایەخێـکم پێ نادرێ لەکارگێری ماڵـەکەمـا ٠

وەهەروەها ئەبێ سەرکردەی سەرکەوتوو ، مرۆڤێـکی لێبوردوو بـە ئارام خۆگرتوو دادپەروەرو بەبەزەیی بێ ٠ وە هەموو ئامۆژگارێکی ئیسلام کە ئاڕاستەی کۆمەڵگای ئیسلامی ئەکا ، ئـەویـە کـە ئـەو خوو ڕەوشت‌و ڕەفتارانەی کە باسمان‌کردن لـە نێوان خێزاندا دروست بکا ، وە لـە شوێنی ناکۆکی‌و دووبەرەکی‌و پشێوی‌و شەڕونۆڕدا ، خۆشەویستی‌و هاوکاری‌و لێبوردن‌و دادپەروەری‌و پێکەوەگونجان لەنێوانیاندا شـوێنی خـۆی بکاتـەوە ٠

وەخوا لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ لـە سوورەتی : ( النساء ـ لـە ئایەتی : ١٩ ) دا :

**( وعاشروهن بالمعروف ) ٠٠**

واتـە : لـەگەڵ ئافرەتاندا بەباشی‌و دادپـەروەری‌و ڕێـك‌وپێـکی هـاو کەوت بکەن ٠

وه پێغەمبەریش دەفـەرمووێ : ( **خیركم خیركم لاهله** ) واتـە : باشترین کەس لـە پیاوان ئـەو کەسەیە کە لەگەڵ خاوو خێزانەکەی بەباشی ئاکار بکاو بجوولێتـەوە .

لێرەدا تەرازووی چاکەو چاکەکاری‌و باشی پیاو بەوە دیاری‌دەکرێ ، کەوا چەند ڕەفتارو ڕێبازو کردەوەی بەرامبەر هاوسـەرەکـەی باش‌بێ ( بەڵام ، بە مەرجێ ئەگەر هاتوو هاوسەرەکەشی بەرامبەر باشی پیاوەکـە گوێ ڕایەڵی یاسای ئیسلام‌و قسەو ئامۆژگاری‌یەکانی پیـاوەکـەی بێ ، ئـەگینا ئـەگەر وانەبوو ، ئـەبێ پیاوەکە کارێـکی وا بکا کە ئافرەتەکـە بگێڕێتـەوە سـەر ڕێڕەوی یاسای ئیسلام ، چونکە پیاوەکە لێ‌پرسراوە بەرامبەر خاوو خێزانەکەی . وە ئەمەش باشترین سـەنگی مەحەکە کـە پیـاوی باش‌و خراپی پێ‌جیا بکرێتەوە .

وە ئـەو پیاوەی کە بەخراپی لەگەڵ هاوسەرو خاوو خێزانـەکەی بجووڵێتـەوە ، دیـارە ئـەو کابرایە هـەر لـە دەروونەوە ، دیارە ئـەو کابرایـە هـەر لـە دەروونـەوە دوو چـاری نـەخۆشـێکی کوشـنـدە بووەو مرۆڤێـکی ناتـەواوە ، ئەگینـا پەیڕەوی فەرموودەکانـی خـواو پێغەمبەرەکەی دەکـا . لێرەشدا ئەبێ ئـەوەش باش بزانین ، هـەر یاساو دەسـتوورێك کـە لە جیهانـدا هـەیە ، ئـەگەر هاتـوو دەسـەڵات و دەسەڵاتدارێکی نەبوو سەرپەرشتی‌و جێ بەجێی بکا ، ئـەوا هەر وەك مەرەکەبی سەر کاغەز وایە ، وەهیچ سوودو قازانجێکی ئـەوتۆ نابەخشێ کە بۆی دانراوە . جـا پێویستە هەر خێزانێك گەورەیەکی هـەبێ کـە ئەویش پیاوە ، بۆ ئەوەی بتوانێ کارگێڕی خێزانـەکە بەباشـی بەڕێوە بەرێ‌و خزمەتگوزاری پێشکەش ئـەو خاوو خێزانە بکا .

هـەر چەندە هەندێك کەس هەنە ، ڕەخنە لـە ئیسـلام دەگـرن‌و

داوا دەکەن ، گوایە یەکسانێکی تەواوو بێ جیاواز لە نێوان پیاوو ئافرەتدا هەبێ ، بەلام ، لێرەدا کێشەکە کێشەیێکی واقیی فرمانی و سروشتی مرۆڤایەتی‌یە ، نەك کێشەکە کێشەیێکی تیوری نموونەیی بێ کە لەگەڵ ڕاست و دروستی سروشتی دروست بوونی جەستەو ئەقڵی‌یەتی پیاوو ئافرەتە نەگونجێ ، کەوا لە سەر هیچ ڕێبازو بنچینەیەك نەبێ و هیچ ئەقڵ و مەنتیقێك قەبووڵی نەکا .

لێرەشدا دەمەوێ ئەم ، پرسیارانە ئاڕاستەی ، ئەو خاوەن بیرو ڕایانە بکەم و بڵێم : ئایا چ ئافرەتێکی تەواوو هۆشمەند ، لە سەر ئەم زەمینەدا هەیە ، کە لە مێردەکەی بدا وە لەپاشدا هەمان ڕێزی لە لای ئەو ئافرەتە بمینێ ، وە لەوە دواش بتوانێ لەگەڵ یەکدا بژین؟ وە ئایا لەچ وولاتێکی پێشکەوتوو ، وەیا دوواکەوتودا ، ئافرەتان داوای ئەوەیان کردووە کە لەمێردەکانیان بدەن ؟ بەڕاستی لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو تاقی کردنەوەدا دەرکەوتووە کە هەر پیاوێك لە هەر خێزانێکدا ، ئەگەر خۆی بەرامبەر ژنەکەی بەکەم دەسەلات پیشان بدا ، ئەم جۆرە پیاوانە هەمیشە ڕێزو نرخیان زۆر کەم دەبێ لە لایان هاوسەرەکانیانەوە ، بەلام ، ئەو پیاوانەی کە جڵەوی دەسەلات بۆ ژنەکانیان درێژ ناکەنەوە هەمیشە بە چاوێکی پڕ ڕێزەوە ژنەکانیان سەیریان دەکەن‌و ڕێزیان لێ‌دەگرن .

## سەرچاوەکانی ئەم پەڕتووکەم


١ ـ قورئانی پیرۆز •

٢ ـ تفسير القرآن الكريم ـ الشهير بتفسير المنار ـ تأليف : محمد رشيد رضا •

٣ ـ التفسير الفريد ـ تأليف : الدكتور محمد عبدالمنعم الجمال •

٤ ـ الرسول وتعدد الزوجات ـ بقلم الشيخ عبدالرحمن النجار •

٥ ـ الاسلام وتعدد الزوجات ـ بقلم ابراهيم النعمة •

٦ ـ محمد وقرآن ـ تأليف جان ديون پورت ـ ترجمة : سيد غلام رضا سعيدي •

٧ ـ الفتاوى : دراسة المشكلات المسلم المعاصر في حياته اليومية والعامة : للامام الاكبر محمود شلتوت •

٨ ـ اسلام شناسی : دکتر علی شریعتی •

٩ ـ شەریعەتی ئیسلام : مەلا عبدالکریمی مدرس •

١٠ـ تەفسیری نامی : مەلا عبدالکریمی مدرس •

١١ـ تەفسیری کوردی : مەلا محمدی کۆیی •

١٢ـ تەفسیری خاڵ : شیخ محمدی خاڵ •

١٣ـ شبهات حول الاسلام : محمد قطب •

١٤ـ الاسلام عقيدة وشريعة للاستاذ محمود شلتوت •

١٥- الاسلام واتجاه المرأة المسلمة المعاصرة للدكتور محمد البهي •

١٦- حقوق الانسان في الاسلام للدكتور علي عبدالواحد وافي •

١٧- دائرة معارف القرن العشرين للاستاذ محمد فريد وجدي ـ الجزء الرابع •

١٨- ماذا عن المرأة للدكتور نورالدين عتر •

١٩- فقه السيرة للاستاذ محمد عزة دروزة •

٢٠- حقائق الاسلام وأباطيل خصومه للاستاذ عباس محمود العقاد •

٢١- الاسلام والمرأة المعاصرة للاستاذ البهي الخولي •

**سـوپاس**

زۆر سوپاسی كاك جبار رەشید دەكەم كە بەرگی ئەم پەڕتووكەی بۆ كێشاوم ، وە هەروەها زۆر سوپاسی كاك قادر عزیزو كاك عمر عبدالله دەكەم كە پێش چاپكردنی ئەم پەڕتووكەم چاوێكیان پیاخشناندووتەوە •

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ٢١٩ لسنة ١٩٨٦

